زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەڵقەی
سێزدەهەم

# کاری ئیسلامیی و

## ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك

عەلی باپیر

ناوی کتێب: کاری ئیسـلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەم‌و مژێک
نوسەر: عەلـی باپیـر
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر
نەخشەشازی ناوەوە: عزالدیـن محـمد عمـر
خەت: نـەوزاد کـۆیی
بەرگ: أمیـن مخلص
نۆرە و سالی چاپ: یەکـەم 1432ك – 2011ز
تیراژ: 1500 دانـە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (2762)ی سالی (2010)ی پێدراوە

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

چاپکردنی نوێی کتێبەکانم بە نوێ بەگوێرەی

توانا و هەل و مەرجی ئەو ڕۆژگارە بوو .

وە لە پێش بووم هیوام وابوو شێوەی چاپکردنێکی

وابێ تا بۆ بەرە خۆشی کە مایەی بەهرە لێوەرگرتنی زیاتری

خوێنەرانم بێ . جارێکی تر سوپاسی خوای بەخشەر

دەکەم کە نووسینگەی تەفسیر بەو کارە هەستا .

خوا بەرەکەتی بخاتە ئیش و کاریانەوە و کۆمەکیان

بێت ، منیش سوپاسیان دەکەم .

عەلی باپیر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى آله

بەندە (عەلى باپير) ڕێگە بە مامۆستا مخلص و

نووسینگەی تەفسیر تەخویل ئەکەم بۆ چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانم، خوا بەرەکەت و خێر زیاتر

بخاتە ئیش و کاریانەوە.

وە جگە لەوان هیچکەسێکی تر مافی چاپ و

بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی بەندەی نییە.

ع

عەلى باپير

١١ ربیع الثانی ١٤٢٦

٢٠٠٥/٥/١٩

هەولێر

# نێـوەڕۆك

ئیسلامییەکان.



تَسْتَوِى وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ
إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى
مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا فصلت.

# پێشکەش بێ

به هەموو ئەوانەی کە، دڵسۆزانە هەوڵدەدەن و کاردەکەن بۆ هەرچی زیاترو چاکتر تێگەیاندنی خەڵك لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتداو پێوەپابەندبوونی، لە هەموو بوارەکانی ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییاندا، بەئامانجی بەختەوەربوون و سەرفرازبوونیان لە دنیاو دواڕۆژدا، لەژێر هەرناوونیشانێك دابن و خاوەنی هەر مەشرەبێك بن.

# پێشەکی و پێناسەی ئەم نامیلکەیە

الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه.

خوێنەری سەنگین!

ئەم نامیلکە یە کۆی دوو ئاڵ قەی بەرنا مەی: ( سەکۆی ڕۆ شنبیریی)یە کە وەك چاوپێکەوتن و وتو ێژ لەلا یەن پێشکە شکاری بەرنامە کەوە ( کاك سامان) لە کەناڵی ئا سمانی (پەیام) لەگەڵ بە ندەدا لە (2009/12/29)و (2010/1/5) ئەنجام دراون و پاش هێنرانە سەر کاغەز[1] بەمجۆرەیان لێهاتوە.

شایانی باسی شە کە جم و جۆڵ و کاری ئی سلامیی لەم ڕۆژگارەما ندا لە گەڵ تۆ مەت و گو مانی زۆرو جۆراو جۆردا ڕوو بەڕوو بۆ تەوە، چ لەلا یەن کە سانێکی عەلمانیی و نا حەزی پڕۆژەی ئی سلامییەوە، کە نەك هەر بڕوا یان بەکارو چالاکیی ئیسلامیی نیە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتەوە ئەگەر بوێرین بڵێین- بڕوایان بە ئیسلام نیە، کە وەك خوا فەرمانی کردوە بەرنا مەو

1) لەلا یەن برای دڵسۆزو بەڕێز مەوە کاك مەلا ( بیلال قەڵادزەیی) یەوە، خوا پاداشتی بداتەوە کە هەتا ئێستا لە بواری هێنا نە سەر کا غەزی وتارەکا نمدا پشکی شێری پێبڕاوە.

پەیڕەوی ژ یان و گوزەرانی تاك و كۆ مەڵ بێ! وە چ لەلا یەن خەڵكێكی مـ سوڵمان و ئیسلامیی شەوە، كە بە پاڵ نەری جۆراو جۆرەوە لەو كارو چالاكیی ئی سلامییەكە لەلا یەن حـ یزب و ڕێک خراوە ئی سلامییەكانەوە ئەنجام دەدرێ، كەوتوو نە تە قەو هەندێكیان هەموو ئامانج و مەبەست و ئەو پەڕی گرنگیی پـ ێدانی خۆ یان لەوەدا چڕكردۆتەوە، كە قو تابی و شوێنكەوتووەكانیان بەوە ئیقناع بكەن، كە حیزب و ڕێكخراوە ئیسلامییەكان، بوونـ یان شتێكی ناڕەوا یەو لادا نە لە جادەی شەریعەت! هەروەها كات و توانا یەكی زۆر لەپێناوی ئەوەدا خەرج دە كەن كە كە سانێكی متمانە پێكراوو بەتوانای نێو كارو پڕۆژەی ئیسلامیی، كە دەزا نن ز یاتر قـ سەیان لـێ وەردە گیرێ و گوێ یان بۆ دە گیرێ، لەپێشـ چاوی قو تابی و شوێنكەوتووانیان بب ێزرێنن و بـ شێوێنن، وەك ئـی سلام و مـ سوڵمانان هیـچ گر فت و كێ شەیەكیان نەمابێ، نا شیرین كران و لەكەداركردنی كەسایەتیی و ڕەمزەكانی نەبێ!

جا سەیر ئەوە یە كە ئەو جۆرە كە سانە پێ شیان وا یەو لا فی ئەوەش لێدەدەن كە پابە ندی قورئان و سوننەت و شوێنكەوتووی پێشینەی چاكن و بە خەیاڵی خۆ یان لە مـسوڵمانەتیی و دیـ نداریی خەڵكی دیكەش ڕازی نین!!

بەڵام هیـچ گو مانی تێداـ یە كە پابە ندیی بەقورئان و سوننەتەوەو شوێنپێ هەڵگرتنی پێ شینەی چاك، بەس بە قـ سەو شیعار نا بێ، وە شتێكی مـ شتومڕ هەڵنەگری شە كە قور ئان و

سوننەت‌و پێشینەی چاکی پابەندیشیان، بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادەن مرۆڤی مسوڵمان ئیش‌و خولیای ببێتە زەم‌و غەیبەت‌و شکاندن‌و بێزراندنی کەسانی مسوڵمان‌و لەولاشەوە لە بەرانبەر کەسانی عەلمانیی‌و دوور لە ئیسلام‌و ڕەخنەگر لە ئیسلام، دەنگی لێوەنەیەت‌و خۆی بکاتە کەڕەی شەربەت! ئایا ئەوە هەمان پیشەی ئەو دەرچووانە (خوارج) نیە کە پێغەمبەر ﷺ لە وەسفیاندا فەرموویەتی: (يقتلون أهل الإيمان وَيَدعون أهل الأوثان...)، واتە: خاوەن بڕوایان دەکوژن‌و واز لە خاوەن صەنەمان دێنن؟!

پاشان شتێکی ئاشکرایە کە لە ئیسلامدا بەپێچەوانەی نەصرانییەتی شێوێنراوەوە، چینی ئەکلیرۆس (طبقة الكهنوت) بوونی نیەو، هیچکەس ئیمتیازو مافی ئەوەی نەدراوەتێ کە خۆی بەسەر ئیسلام‌و مسوڵمانانەوە بکاتە چاودێرو وەصیی‌و بە ئارەزووی خۆی شەرعییبوونی بوون (شرعية الوجود) یان، بخاتە ژێر پرسیارەوەو، وەك چۆن پاپاوقەشەکان پسوولەکانی لێخۆشبوون (صكوك الغفران)یان بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرد، لە بەرانبەر ئینتیمایان بۆ کڵێساو پیاوەکانی‌و دەستکەوتێکی دنیاییدا، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوەی بە نەیاری خۆیان زانیبایە لە بەهەشت‌و مەلەکووتی خوا بێبەشیان دەکرد، ئەویش بێ، هەر کەس بەپێی ئارەزووی بوو، بە مسوڵمانی باش‌و شوێنکەوتووی سەلەفی صالح‌و، بە پێچەوانەوەش هەر کەس بەدڵی نەبوو بە لادەرو سەرلێشێواوو چی‌و چی ناوزەدی بکات!

بەڵێ بەڕاستی شتێکی سەیرو نامەنتیقییە مرۆڤ ئیددیعای پابەندیی بە قورئانو سوننەتو شوێنکەوتنی سەلەفی صالح بکات، کە چی دم بەدەمەو مەشتومڕ لەبارەی شەرعییبوونی هەبوونی لایەنە ئیسلامییەکانەوە بکات، کەچی لە ئاست حیزبە عەلمانییەکانو شەرعییبوونو شەرعییەنەبوونیانەوە بێدەنگ بێت! واتە: ڕەخنە لە کۆمەڵە مسوڵمانێك بگرێ، کە بە مەبەستی گۆڕینو پاک سازییو چاک سازیی کۆمەڵگا کەیان لە سەر بناغەی ئیسلام کۆبوونەتەوە، تاکو باشتر بتوانن ئەرکی بانگەوازو فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە ئەنجام بدەن! بەڵام لەو کۆمەڵو تاقمانە بێدەنگ بێت کە لەسەر بناغەی سیکۆلاریزمو لیبڕالیزمو سۆسیالیزمو کاپیتالیزمو... هتد، خڕبوونەتەوەو مەگەر بۆ چەواشەکردنیش ئەگەرنا کەمو زۆر باسو خواسی ئیسلامو مسوڵمانەتییان لەلا نیە!!

بەهەرحاڵ ئێمە سوپاس بۆ خوا (سبحانە وتعالی) لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا تا ڕاددەیەکی باش بە تیشکی قورئانو سوننەتو عەقڵی سەلیم تەمو مژی سەرجەم ئەو گومانو تۆمەتو شوبهانەمان ڕامالیوە، کە لەلایەن ئەو جۆرە کەسانەوە بەرانبەر بە کارو پڕۆژەی ئیسلامییو لایەنە ئیسلامییەکان لەملاولا دەخرێنەڕووو، دەریشمان خستوە کە بە پێچەوانەی قالەو گالەی ئەو جۆرە کەسانەوە، زانا و پێشەوایانی کۆنو تازەی متمانە پێکراوی شمان، هەر هەمان هەڵوێستو تێڕوانینیان لەوبارەوە

هەیە کە ئێمە هەڵمانبژاردوەو هەموو خاوەن عەقڵێکی سەلیمی لە ئیسلام تێگەیشتووش هەر ئەوە هەڵدەبژێرێ.

لە ڕاستیدا من پڕ بەدڵ بەزەییم بەو جۆرە کەسانەدا دێتەوە کە بەو جۆرە سەرو سینەیەوە مامە ڵە لە گەڵ کارو پڕۆژەی ئیسلامییو لایەنە ئیسلامییەکاندا دەکەنو، نازانم ئا یا ئەو بیرۆکەو بۆچوونە سەقەتو ناشەرعییو زیانبەخشەیان لەکێو لەکوێوە وەرگرتوە؟!

فەرموون: ئەوە قورئانو سوننەتو ئەوەش قسەو بیروڕای زاناو پێشەوایانمان: هەموویان پێچەوانەی ئەو جۆرە بیرۆکەو تێڕوانینەن، کە بێگومان جگە لە دوژمنو ناحەزانی ئیسلامو موسوڵمانان هیچکەسی دیکە سوودی لێ نابینێو پێی دڵخۆش نییە مەگەر سەرود لێ نەخۆش بێ، یان زۆر فەقیرحاڵو چەواشەکراوو بێهۆشو گۆش بێ!

خوا بە بەزەییو بەخششی بێ سنووری خۆی زیاتر هیدایەتی هەموو لا یەکمان بداتو لە لادانو خلیسکانو ئیستیغلالکران، لەلایەن ناحەزانی ئیسلامو موسوڵمانانەوە، بمانپارێزێو لە عەیبداریی دنیاو گوناهباریی قیامەت چەپاڵەمان بدات.

نووسەر

1ی ذي الحجة 1431

2010/11/7 هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

# ئاڵقەی یەکەم

## دەقی چاوپێکەوتنەکە

﴿ کە لەبارەی (کۆ مەڵکاری ئیسلامیی) و دروستکردنی پارتو ڕێکخراوی سیاسییەو ئامانجیش لێی: ڕەواندنەوەی چەند تەمو مژێکە لە دەورەی کارو چالاکیی و پرۆژەی ئیسلامیی﴾.

- سەرەتا مامۆستا گیان زۆر سوپاس بۆ ئامادەبونتان.

* سوپاس بۆ ئێوەش

- مامۆستا گیان! دیارە بە شێوەیەکی گشتی حەزدەکەین ڕاو سەرنجی جەنابتان لەبارەی کارو تەوژمی ئیسلامیی لەجیهانی ئیسلامییدا بەگشتیو کوردستاندا بەتایبەتی وەربگرین، ئایا ئەو بنەما سەرەکیو هێڵە گشتییانە چین، کە پێویستە ئەمڕۆ مسوڵمانان لەنێو کاری ئیسلامییدا جێبەجێیان بکەن؟

* بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله، و صلوات الله و سلامه وبركاته على رسول الله محمد وآله وصحبه ومن اهتدى بهداه.

سەرەتا من دەمەوێ سوپاسو دەستخۆشی ئاراستەی برای بەڕێزمان مامۆستا دلێر گەرمیانیی بکەم، کە لە چەند

ئاڵقە یەکی پێ شووی ئەم بەرنامە یەدا بە شداریی کردوەو، بەو پێ یەی کە بەمن گەیـ شتۆتەوە خەڵکێکی زۆر بەر چاوی ڕۆ شن بۆ تەوەو، هەڵوێ ستیان گۆڕاوە، سەبارەت بە ڕەوا یی هەبوونی لایەنو کۆمەڵە ئیسلامییەکان، من سوپاسی دەکەمو خوا پادا شتی بداتەوە، هەرچەندە من پێم نەکراوە وەك پێویـ ست موتابە عەی هەموو بەرنا مەکانی بکەم، بەڵام وەك بیـ ستوومە بە ئینـ سافەوە قسەی کردوەو، کەمتر قسەی خۆی کردوە، بەڵکو ز یاتر قسەی زانایانو پێشەوایانی لەوبارەوە هێناوە.

بۆ وەڵا می ئەو پر سیارەی جەنابتو بۆ ڕەواند نەوەی چەند تەمو مژێك لەدەوری کارو جمو جۆڵی ئیـ سلامیی، من سەرەتا بەپێویستی دەزانم چەند بنەمایەك بخەمە ڕوو، کە پێموا یە ئەو بنەمایا نە خاڵی هاوبە شی هەموو ئیـ سلامییەکانن، وا تە خاڵی هاوبەشی تەوژمی ئیسلامیین بە هەموو پێکهاتەکانییەوە، چونکە بەڕا ستی من لـ ێرە نەهاتوومو دانەنیـ شتووم بە شداریی ئەم بەرنامەیە بکەم، بۆ ئەوەی بەرگریی بکەم لە لایەنێکی دیاریکراو، لەبەرئەوەی من بەگـ شتی خۆم بە دڵسۆزی ئیـ سلامو مـ سوڵمانان دەزانمو، ئەو ڕا ستییانەی کە دەیانخە مەڕوو، مەبە ستم پـ ێی بەرەو پێـ شبردنی کارو جمو جۆڵی ئیـ سلامییە بەتێکڕایی، ڕ یزی تەواویشم هەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە لە مە یدانی کارو چالاکیی ئیـ سلامییدا ئە سپی خۆ یان تاوداوەو تاوی دەدەنو، دوو عای خێریش بۆ هەموو لا یەك دە کەین، لە بەر ئەوە من ئەم چەند

خا ڵە بەخاڵی هاو بەش و بە چەند بنەما یەکی گشتی دەزانم، کە سەرجەم لا یەن و پێکها تەکانی کارو پرۆژەی بووژاند نەوەی ئیسلامیی تێیاندا بەشدارن:

**خاڵی یە کەم:** تەنیا ئەوە ئیسلامە کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو، هەر ئەوەش پابەندکەر (مُلْزِم)ە بۆ ئێمە:

واتە: ئێمەی مسوڵمان لە سەرمان پێویستە کە پابەندبین بە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتداو هەموو ئەوەی دیکە کە هە یەو گوتراوەو دە گوترێ، لە ئیجتیهادی زانا یان و لە بیروبۆ چوونیان و لە مەزهە بە فیقهی یەکان، لە ڕێبازە کانی تەزکیەو تەصەووف، لە هەوڵ و تێکۆشانی زانا یان، لە ئەزموونی لایەنە ئیسلامییەکان، هەر هەمووی بە تێگەی شتنی ئەوان دەربارەی قورئان و سوننەت دادەنرێ و، بۆ هیچ کەس پابەندکەر (مُلْزِم) نیە وەك دین، چونکە خوا یەك دینی بۆ ئێمە ناردوە: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ...﴾ آل عمران ١٩، واتە: بەرنامە لای خوا بەس ئیسلامە، ئیسلامیش لە وەحیی خوادا بەرجەستەیە، وەحیی خواش لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ درەو شاوەتەوە، وەك خوای پەروەردگار دە فەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ...﴾

وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ وَمَنَ النحل، واتە: قورئانمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار (ئەی موحەممەد ﷺ) تاکو ئەوەی بۆ خەڵك نێرراوەتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بۆ ئەوەی بۆ خۆشیان بیربکەنەوە، لێرەدا خوای کاربەجێ باسی دوو شتمان بۆ دەکات:

- باسی (ذکر) دەکات کە قورئانە و بۆیەش ناونراوە (ذکر)، چونکە ڕاستییە خوارسکەکان بیری مرۆڤ دەخاتەوە.
- وە باسی ڕوونکردنەوە (تبیین)ی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە لە سوننەتەکەیدا بەرجەستەیە، چونکە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ یان فەرمایشتەکانی کە بە دەمی موبارەکی فەرموونی، یان کردەوەکانی، یاخود دانپێداهێنانەکانی، واتە: ئەو شتانەی لەبەر چاوی کراون، یان گوێبیستیان بووەو، ئەویش دانی پێداهێناون، یانی لێیان بێدەنگ بووەو ڕەخنەی لێنەگرتوون.

بەڵام بێگومان پێویستە بۆ چۆنیەتی پیادەکردنی قورئانو سوننەت (واتە: قورئانو ڕوونکردنەوەکەی) بیرکردنەوەو عەقڵی خۆشمان بەکاربێنین، بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: أَحْسَنُ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ وَمَنْ، کەواتە: هیچ کەسێك بەهیچ ناوو نیشانێك بۆی نیە قسەی خۆیو هەڵوێستی خۆیو بیروبۆچوونی خۆی، یاخود هی زاناو پێشەوایەك بکاتە دین، بەڵکو دین تەنیا قورئانو سوننەتە، کە هەر ئەوەش (وحي) یەو دیارە غەیری

وەحیی بریتیە لە تێگەیشتن دەربارەی وەحیی.

**خاڵی دووەم:** کاری ئیسلامیی بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانی تێگەیشتوو و دڵسۆزە:

مەبەستمان لەکاری ئیسلامیی بانگەوازکردنی خەڵکە بۆلای خوا (سبحانە و تعالی) و ئایینەکەی‌و، فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەیەو، هەوڵدانە بۆ خستنە ڕووی ڕاستییەکانی ئیسلام‌و، پیادەکردنی شەریعەتەکەیەتی لە ژیانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵیی‌و سیاسییدا، وە سەرەنجام دابینکردنی مافو ئازادییەکان‌و پێداویستییەکانی ژیانی خەڵك لەژێر سایەی شەریعەتدا.

بەڵێ بێگومان هەر مسوڵمانێك لە دین تێبگات‌و دڵسۆزیش بێ بۆ دین، کەم‌و زۆر دەجووڵێ‌و خەڵکی بۆ بانگ دەکات‌و فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکات، وە هەوڵ دەدات زانستی شەرعیی بڵاوبکاتەوەو، خەڵك لە قورئان‌و سوننەت تێدەگەیەنێ‌و پەروەردەیان دەکات، بۆیە دەڵێین: کاری ئیسلامیی بە چەمك‌و واتا گشتییەکەی، خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانی تێگەیشتوو و دڵسۆزە، واتە کاری ئیسلامیی لە سەر لایەن‌و دەستەو توێژێك قۆرخ‌و تاپۆ نەکراوە، هەر لە مامۆستایەکی سەر مینبەرەوە بگرە تاکو سۆفییەك، کە خەریکی تەزکیەی نەفس‌و زیکرو ویردێکە، یان گەنجێك کە دەیەوێ لە دین تێبگات‌و نوێژو

خوا پەرستییەکەی بەشێوەیەك بێ کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، یان سیاسی یەك کە دەیەوێ بارودۆخ بگۆڕێ بەجۆرێك کە لە گەڵ شەریعەت بگونجێو... هتد، هەموو ئەوانە لەنێو بازنەی کاری ئیسلامییدان، چونکە بەجۆرێك لە جۆرەکان مشوور لە ئیسلام دەخۆنو کار بۆ بووژاندنەوەو تازەکردنەوەی دینداریی دەکەن.

**خاڵی سێیەم:** تەرازوو و پێوەری هەڵسەنگاندن بۆ مسوڵمانان، پێویستە ئیمانو تەقوایان بێ، نەك لافیتەو ناوو نیشانێك کە لەسەر سەری خۆیان بەرزیان کردۆتەوە:

واتە: بەئەندازەی ئەوە کە ئیمان لە کە سێکدا دەبینین - هەڵبەتە ئیمان پەنهانە ئەو شوێنەوارەکانی ئیمان دەبینرێن- وە بەئەندازەی ئەوە کە پارێزکاریی و چاکەکاریی (التّقوی والإحسان)ی پێوە شك دەبەین، بە مسوڵمانێکی ڕاستو ساغو چاك لەقەڵەم دەدرێ، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە لە (صحيح البخاري) دایە، دەفەرموێ: ((التّقوى هاهُنا)) سێ جار ئاماژەی کردوە بۆ سینەی موبارەکی، واتە: ئەسڵی تەقوا لە سینەدایە، بەڵام شوێنەوارەکانی دەردەکەون، کە بریتییە لە پابەندیی بە شەریعەتەوە، بەڵێ هەڵسەنگاندنمان بۆ مسوڵمانان پێویستە پێوەرەکەی ئیمانو تەقوا بێ، چونکە خوای پەروەردگار

دە فەرمویٚ: أَحْسَنُ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ وَمَنْ يونس

تە: ئا گاداربن دۆ ستەكانى خوا نەتر سيان لە سەرە نە پەژارە دايانده‌گریٚ، ئەوانەى ئيمانيان هێناوەو پارێز دەكەن.

وە خوا ( سبحانه و تـ عالى) دە فەرمویٚ: أَحْسَنُ ...إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ...﴿١٣﴾ وَمَنْ الحجرات، واتە: بێگومان بەڕێزترتان لاى خوا پارێزكارترتانە.

كەواتە: مرۆڤ هەتا پارێزكارترو زياتر ئەهلى تەقوابیٚ، لاى خوا ڕێزو حورمەتى زياترە، بۆيە هەركەسێك مسوڵمان بیٚ، دە بیٚ كیٚ زياتر بەتەقوا دێتە بەرچاوى، لە دڵيدا شيرينترو خۆشەويسترو سەنگينتربیٚ، چونكە ئەو كە سە لاى خوا بەڕێزترە، جا ئا يا كە سێك لاى خوا بەڕێزو سەنگينو شيرين بیٚ، نا بیٚ لاى تۆش هەروابیٚ؟! كەوا تە: نا بیٚ تۆ بڵ يیٚ: نەخێر دە بیٚ ئەوكە سە حەتمەن لە بازنەكەى مندابیٚ، يان دەبیٚ حەتمەن هاومە سلەكو هاومەشڕەبى من بیٚ، يان دە بیٚ حە تمەن ناوو نيشانەكەى منى لەسەربیٚ، ئنجا خۆشم بویٚ! بێگومان نەخێر، چونكە كە واتكرد، د يارە تۆ بە تەرازووى خۆت خەڵك هەڵدە سەنگێنى، نەك بە تەرازووى خوا، ئەوە بنەمايەكى زۆر گرنگە!

- لە هە نديك كتێبدا وەك دەبينين چەند زانا يەك ياخود

جۆرێك له بیـرکردنەوەی زانایانی پێشوو ئەوە تایبەت دەکەن به ئیسلام، وە دەیکەنە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵك.

* له سەرەتاوە با سمکرد ئی سلام له قورِ ئانو سوننەتدا بەرجه ستەیە، هەر زانا یەك هەر چەندە زۆر گەورەش بێ، سەرەنجام بیروبۆ چوونو تێگەی شتنەکانی بریتین له تێگەیشتنەکانی ئەو دەربارەی قورئانو سوننەت، وا تە: دین نین تاکو ئێمه پێ یەوە پابه ند (مُلْزَم) بینو حه تـمەن دە بێ شوێنی ب کەوین، بەڵکو گوێڕا یەڵیی و فەرمانـ بەریی ڕەها مان تەنیا بۆ پێغەمـ بەری خوا ﷺ هه یە، ئەویش له بەر ئەوەی پارێزراو (مٌعصُوم)ە لەلا یەن خوای پەروەردگارەوەو، هه ڵه نا کاتو ئه گەر هەڵه یەکی ئیجتیهادی شی کرد بێ، خوای به بەزەییو کار بەجێ بۆی ڕاست کردۆتەوە.

**خاڵی چوارەم:** <u>عیـبـرەت به نـێوەڕۆكو نێواخنەکا نه نەك به ناوونیـ شانەکان: (الـ عبرة بالمحتو یات وا لـمضامین، ولیـ ست بالأسـماء والعناوین): !</u>

بەڕاستی ئەگەر ئێمه باش لەم ڕاستییه تێبگەین، لەزۆر جۆره حوک مدانی هه ڵەو کرچو کاڵ، بەراد بەر به مـ سوڵمانان دەپارێزرێ ین، چۆن؟ بۆ وێ نه: که سێك ناو لەخۆی دە نێ

موجاهید، ئایا تا جیهاد نەکات بەو ناو لەخۆنانە دەبێتە موجاهید؟!

بەدڵنیاییەوە نەخێر، یەکێکی دیکە ناو لەخۆی دەنێ زانا (عالم) ئایا ئەگەر زانیاریی و شارەزایی نەبێ، دەبێتە زانا (عالم)؟!

بێگومان نەخێر، یان ئایا هەر بەپۆشینی بەرگ و پۆشاکی مەلایەتیی و مامۆستایەتیی، هیچکەس دەبێتە مەلاو مامۆستا؟

دیارە نەخێر! هەروەها پزیشکێك یان ئەندازیارێك، ئەگەر ئەویان لە پزیشکییداو، ئەمیان لە ئەندازیارییدا شارەزاییان نەبێ، بێگومان هەر بەو ناوو نازناوەکەیان نابن بە پزیشك و ئەندازیار، کەواتە: بەهەمان شێوە کەسێك کە پێی دەگوترێ ئیسلامیی، سەلەفیی، سۆفیی...هتد، بەناوو نیشانەکانیان نابن بەو شتە کە پێیان خۆشە، سۆفیی ئەگەر بە کردەوە خۆی ساغ و ساف نەکاتەوە، لە خڵتەو ژەنگ و ژاری شیرك و بیدعەت و ڕیاو ناشەرعییەکان، هەر بەو ناوەی لەخۆی ناوە نابێ بە سۆفیی، هەروەها ئەگەر کەسێکی بەناو سەلەفیی بە کردەوەو هەنگاوو هەڵوێست، بەدوای پێشینەی چاك (السلف الصالح) نەکەوێ، تەنیا ناوەکەی شەفاعەتی بۆ ناکات! وەك چۆن پاکەتێك کە خوێی تێدابێ، هەر بە لەسەر نووسرانی (هەنگوین)، نابێ بە هەنگوین و هەر خوێیە!

بەڕاستی زۆر گرنگە کە ئێمە داکۆکیی لەسەر ئەوە بکەین و

جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە، کە خۆمان‌و خەڵك، نێوەڕۆكمان بەو شێوەیەبێ کە لەلای خوا پەسندە، ئەگەرنا زۆرجار ناوی باش لەخۆنان‌و نازناوی چاك لەخۆنان، بەبێ کۆشش کردن بۆ ئەوەی نێوەڕۆکێکی وەك خۆی هەبێ، دەبێتە مایەی تەزکیەی نەفسی خۆکردن‌و خۆپەسندیی، ڕیا بازیی، چۆن؟ بۆ وێنە: یەکێك دەڵێ: من موجاهیدی ڕاستەقینەم، یان سۆفییم‌و ساف بوومەوەو خڵتەم پێوە نەماوە، یان دەڵێ من سەلەفییم‌و لەسەر ڕێبازی سەلەفی صالحم!

بێگومان ئەوە دەبێتە تەزکیەکردنی خۆی‌و مەدحی خۆکردن‌و خۆ هەڵدانەوە، ئەگەر بەکردەوە وانەبێ، مانای وایە بەر ئەو ئایەتە دەکەوێ، کە دەفەرموێ: أَحْسَنُ...فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ النجم، واتە: خۆتان بەپاك‌و چاك مەزانن، خوا زاناترە کە ئایا کێ پارێزکاریی کردوە، بۆیە پێشینەی چاکمان ڕەحمەتی خوایان لێبی، هەندێکیان کە پرسیاریان لێکراوە: ئایا تۆ بڕوادار (مؤمن)ی؟ لە وەڵامدا گوتوویەتی: بەڵێ، ئەگەر خوا بیەوێ (نَعَمْ، إنْ شَاءَ الله)! چونکە گوتوویانە: ئەگەر بەبێ (إنْ شاءَ الله) گوتن، وابڵێین، دیارە دڵنیاین‌و یەقینمان هەیە کە دەچینە بەهەشت " بەڵێ بەدڵنیایی یەوە ئیما نداران دەچنە بەهەشت‌و لەلایەن خواوە بەڵێنیان پێدراوە" بەڵام گوتوویانە: نازانین سەرەنجام (خاتمة)مان چۆن دەبێ، وە نازانین کە ئایا

مەرجەکانی ئیمانـمان هەموو تێدا هاتوونەدی یان نا؟ بەڵام دیارە کە لێ یان پر سراوە: ئا یا م سولمانی؟ گوتوویا نە: بەڵێ، چونکە مسولمانێتی ڕواڵەتو ئاشکرایە.

**خاڵی پێنجەم:** شوێن پێ هەلگرتنی پێغەمبەر ﷺ و شوێن پێ هەلگرتنی پێ شینی چاك (ال سلف ال صالح)مان ڕە حمەتی خوایان لێبێ، خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسولمانانە:

دیارە پێشەوای پێ شینی چاك پێغەمبەری خوا یە ﷺ، پا شان هاوەڵانی بەڕێزو ئن جا شوێنکەوتووانیانو شوێنکەوتووانی ئەوانیش، کە بەرنامەی ئەوانیش قورئانو سوننەتە، وا تە: هیچ مسولمانێك نیە نکوولیی لەوە بکات کە دەبێ بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺو بەدوای هاوەڵانی بەڕێزیو، بەدوای پێ شینی چاك بکەوێو قورئانو سوننەت بەرنا مەی ژ یانی بێ، بۆ یە هیچ کەسێك بۆی نیە ئەوە لە سەر خۆی قۆرخو تاپۆ بکاتو خەڵکی دیکەی لێ مەحرووم بکات، ئاخر کێ ئەو مافەی پێداوە؟!

هەروەها ڕەوا نیە کەسانێك بانگەشە بکەنو بڵێن: تەنیا ئێمە لە سەر ڕێ بازی پێ شینی چاک ین! بۆ چی برا لە! ئەدی پێتوا یە خەڵکی دیکە بەدوای (هەڵلای مام کوێخا) کەوتوە؟!

نەخێر ئێمە وەك ئەهلی ئیمانو ئیسلام، هەموومان دەما نەوێ بەو شێوەیە بینو بەوجۆرە بژین، کە پێشینی چاکمان بوونو ژیونو ئیمانو عەقیدەو عیبادەتو جۆری تێگەیشتنمان بۆ دین،

وەك هی ئەوان بێ، بەڵام دە بێ ور یابین، پێ شینی چاکمان لە جـ یاتی ئێ مە ئیجتیهاد یان لەو مە سەلانەدا نەکردوە کە لە سەردەمو ڕۆژ گاری ئێ مەدا پە یدا دە بن! تەما شا دە کەین ( شیخ الإ سلام إ بن تیمـ یة) ڕە حمەتی خوای لێ بێ (مجـ موع الفـ تاوی)ی هە یە کە سیو پـ ێنج (□□) بەر گە، خۆ لەپێش ئەودا زا ناو پێشەوایانی زۆر ئیجتیهاد یان کردوە بۆ سەردەمی خۆ یان، ئەدی بۆچی ئەو بەپێویستی زانیوە هێندە فەتوا بداتو ئیجتیهاد بـکات، کە لە (□□) بەر گدا کۆبکرێ تەوە؟ د یارە هۆکارە کەی ئەوە یە لە سەردەمی ئەودا زۆر مە سەلەو با بەتی نوێ هاتوو نە پێشو پێویست بووە بیری تازەیان لێ بکرێتەوەو ئیجتیهادی تایـبەتییان بۆ بکرێ، (بۆیە شوێنکەوتنی ئێـمە بۆ پێ شینی چاك، ئێـمە بێ ئیحتاج ناکات لە بەکارهێنانی عەقلی خۆمان)(□) .

---

(□) بۆیە ئەو د ێڕەم خـستۆتە نێوکەوا نەوە، چونکە بیـستم کە هە ندێك کە سی سادەو فەقیرحاڵ، ئەم قسەیەی بەندەیان کردۆتە ناوونیـشانی نامیلکە یەك کە بەحیساب وەك ڕەخنەگرتن ئاڕاستەی بەندەیان کردوە!

جا د یارە ئەو هەڵوێ ستەم هێـ ندە پێ سەیرو ناماقوو ڵە، ئە گەر دەر فەتم هەبووا یە دەبووا یە کتێ بێکم لە سەر دانابا یە، بەڕا ستی سەیرە ڕەخـ نە لەوە بـ گیرێ کە بـ گوترێ: پێوی ستە عەقلی خۆ مان بەکاربێنین و بە بـ یانووی شوێنکەوتنی پێ شینی چاك واز لە بیرکرد نەوەی خۆ مان نەهێنین، ئاخر مەگەر دە گونجێ بەبێ عەقلّ و تێفـ کرین، نەك شوێن پێ شینی چاك، بـ گرە، قورئانو سوننەتیش بکەوین؟!

بەڵێ مەسەلەو بابەتەکانی عەقیدەو عیبادەت، شەریعەت خاڵی تێدا خستوونە سەرپیتو شتێکە بڕاوەتەوە، بەڵام ئەدی بواری سیاسەتی شەرعییو هەڵسوکەوتو عادەتەکانو مامەڵە لە گەڵ بابەتە تازە پەیدابووەکاندا! بێگومان ئەوە پێویستی بە ئیجتیهادی تازەو بەکارهێنانی عەقڵی خۆمان دەکات، کە بێگومان ئەوەش هەر شوێنکەوتنی سەلەفی صالّحە، چونکە ئەوان لە بەردەم ئەو مەسەلانەدا دەستەو ئەژنۆ دانەنیشتوون، بەڵکو هەر مەسەلەیەکی تازە یان بۆ هاتبێتە پێش، لە بەر ڕۆشنایی قورئانو سونەتدا ئیجتیهادیان بۆ کردوە.

کەواتە: ئەگەر ئێمەش بۆ هەموو ئەو مەسەلەو بابەتانەی تازە دێنە پێش ئیجتیهاد بکەینو لە قورئانو سونەت حوکمیان بۆ هەڵبێنجین، ئەوە لەوەشدا هەر بەدوای پێشینی چاکمان کەوتووینو، بێگومان ئەوەش هەر خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو مسوڵمانانە، مەگەر کەسێك بە نەزانیی عەقڵی خۆی پشتگوێ خستبێ، بە پێچەوانەی فەرمانی خواوە کە لە چەندان ئایەتدا فەرمانی بە بیرکردنەوەو بەکارهێنانی عەقڵ کردوە!

---

ئایا خوا (سبحانه و تعالى) نەیفەرمووە: أَحْسَنُ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ وَمَنْ الإ سراء؟! کەوا تە: دوای ڕوونکردنەوەی پێغەمبەریش ﷺ هەر پێویستە عەقڵی خۆمان بۆ تێگەیشتنی قورئان بەکاربێنین و بیربکەینەوە.

**خاڵی شەشەم: هەرکەسێك عەقڵ‌و ویژدانی هەبێ دان دەنێ بە فەزڵ‌و چاکەی هەموو پێکهاتەکانی تەوژمی ئیسلامیی دا:**

بەڵێ هەرکام لە: زانا یان‌و مامۆ ستایانی مز گەوت، لایە نە ئی سلامییەکان، ئەو خو شك‌و برایا نەی کە ناز ناوی سەلەفییان لە سەرە، ئەهلی طەریـ قەت، کە سایەتییە ئی سلامییە سەربەخۆیەکان، کە سەر بەهیـچ کام لەو قوتابخا نەو مە شرەبانە نین، هەموو ئەوانە چ لە هەرێمی کورد ستان‌و عێرا قدا بن، چ لە هەموو جیهانی ئی سلامییدا، بەڕا ستی پ شك‌و بە شیان لە تەوژمی ئی سلامییدا هە یەو خز مەتێکی زۆر گەورەیان پێ شکەش بە ئیسلام‌و مسوڵمانان کردوە، چونکە ئەو خەڵکە مـسوڵمانەی ئێ ستا هە یە، یان گوێبی ستی ق سەی مامۆ ستاو زانا یەك بووە، یان لا یەنێکی ئی سلامیی دە ستی گر توەو پەروەردەی کردوە، یان سوودی لە قوتابخانەی سەلەفیی بینیوەو بەرچاوی ڕوون بۆ تەوە، یان ئەهلی تە صووف پەروەردەو تەزکی یەیان کردوە، یان کەسایەتیی‌و بانگخوازێکی ئیسلامیی پێی گەیاندوە!

کەواتە: پێویستە ئێمە زۆر بە ئینسافەوە تەماشای بەر هەمو شوێنەواری چاك‌و پڕ لەخزمەتی هەموو پێکهاتەکانی تەوژمی ئیسلامیی بکەین بەبێ ج یاوازی، هەرکە سێکیش بەر هەمو شوێنەوارو پەرێزی باشی زیاتر بوو، تەقدیرو ڕێزی زیاتر مان بۆی هەبێ‌و دووعای خێری بۆ بکەین، بەبێ ئەوەی کە لەسەری پێویست بکەین کە حەتمەن دەبێ مۆری ئێمەو ناز ناوی ئێمەی لە سەربێ‌و، هاوڕێ‌و هاوبیری ئێمە بێ، نەخێر ئەگەر ئێمە دڵسۆزین بۆ دینی خوا (تبارك و تعالى)، پێویستە تەماشا بکەین کێ زیاتر شوێنەواری باشی بووە لە وڵاتەکەماندا، لەنێو میللەتەکەماندا، بۆ دینی خوا (عزّ وجلّ)، وە خەڵکی لە دینی خوا شارەزا کردووەو لەخوا نزیك خستۆتەوە، دەبێ خۆشمان بوێ، وەك گوتم: دەبێ بە تەرازووی خوا (سبحانه و تعالى) خەڵك هەڵسەنگێنین!

ئنجا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین چەندان کەس بەهۆی ڕێکخراوو لایەنە ئیسلامییەکانەوە، خوا هیدایەتی داوەو لە حیزبە عەلمانیی‌و دوور لە خوایەکان، یان هەر لە کوفرو دوور لە خوایی‌و گوناهو خراپەو سەرپێچی دوورکەوتۆتەوە، جا چۆن دەبێ سوپاسی ئەو لایەنە ئیسلامییانە نەکرێ؟! وە چۆن دەبێ بەڕێزو تەقدیرەوە تەماشای کردو کۆششیان نەکرێ، کە بوونە هۆی هیدایەتدانی سەدان هەزار کەس‌و، ئەگەر لە سەر ئاستی جیهانی ئیسلامیی تەماشا بکەین ملیۆنان کەس، یاخود زانایانی

ئیس ـلام‌و ئەهلی مینذ بـەرو میر حزاب کە بە و تارو دەرس‌و پەرەپێدانی زانستی شەرعیی یان، کاریگەریی زۆر یان بووە لە گەڕانەوەی خەڵك‌و چەوا شە نەبوونیان‌و تێگەیش ـتنیان لەدین، چۆن دەبیّ بە چاوی ڕێزو تە قدیر تەما شای پەرێزو بەر هەمیان نەکریّ؟! یا ئینتیمای سیاسیی‌و حیزبـییشیان بۆ ئێمە نەبیّ، یان هاومەشرەب‌و هاومەسلەك نەبن لەگەڵ فلاّن لایەندا؟!

پاشان ئەگەر تەماشای ڕەوتی سەلەفیی بکەین، کە بەدا خەوە هەندێك کەس وادەزانیّ ئێمە هەستیارییمان هەیە بەرانبەر بە ڕەوتی سەلەفیی! نەخێر، ئێمە خۆمان بە شوێنکەوتووی ڕێبازی سەلەفی صالّح دەزانین‌و، خۆمان بە هەڵگری نێوەڕۆك‌و واتای ئەم نازناوە دەزانین، هەرچەندە بەکارهێنانی ئەو ناوەمان وەك ناوو نیشان پیّ شتێکی پەسندو باش نیەو، پێمان وایە جۆرێك لە خود پەسندیی‌و خۆ تەزکیە کردن دەگەیەنیّ، وەك پێشتر باسمان کرد، هەروەها سەردەکێ شیّ بۆ جۆر ێك لە خۆ دا بڕین‌و خۆ جیاکردنەوە لەمسوڵمانان، وەك ئێستا لە واقیعی هەندێك لەو جۆرە کەسانەدا کە ئەم نازناوەیان هەڵگرتوە دەیبینین، هەڵبەتە ئەگەر بۆ خۆڕێکخستن‌و درو ستکردنی چوار چێوەیەکی ڕێکخراوەیی بیّ، بە شتێکی ڕەواو ئا سایی دەزا نین، بەڵام بەمەرجێك هەڵگرانی ئەو ناوو نیشان‌و نازناوە، گومانی وایان بۆ دروست نەبیّ‌و وانەزانن کە ئەوان هەر لەبەر ئەوەی ئەو ناوەیان

لەخۆیان ناوە، لە مسوڵمانانی دیکەی کە ئەو ناوەیان هەڵنەگرتوە چاکترن‌و، خەڵکی دیکەی مسوڵمان هەر لە بەر ئەوەی ناو یان (سەلەفیی) نیە، لە شوێنکەوتنی سەلەفی صالح بێبەشن!

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقی ئێمەیەو، لەدوای ئەویش هاوەڵانی بەڕێز (خوا لێیان ڕازی بێ)، چونکە وەك ئەوان لە دین تێگەیشتوون‌و پێیەوە پابەند بوون، هیچ کەس بەو شێوەیە نەبووە، بەڵێ ڕەوتی سەلەفیی، نەك هەر کاریگەریی هەبووە بۆ ئەوەی خەڵك لە دین‌و لەقورئان‌و سوننەت تێبگات، بەڵکو کاریگەریی باشی هەبووە بەگشتی بۆ ڕەوتی ئیسلامیی‌و وایکردوە زۆرجار لایەنە ئیسلامییەکان‌و مامۆستاو بانگخوازان‌و ئەهلی تەصەووف بەخۆیاندا بچنەوە، چونکە ڕەوتی سەلەفیی کە زۆر باسی شیرك‌و تەوحیدو باسی بیدعەت‌و سوننەتیان کردوە، ئەوە وایکردوە هەموولایەك موراجەعەی ئیمان‌و عەقیدەو عیبادەت‌و هەڵسوکەوتەکانی خۆیان بکەنەوەو، دووربکەونەوە لە بیدعەت‌و شتە داهێنراوەکانی نێو دینداریی! بۆیە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئەو هەڵوێستانە سوپاسیان دەکەین‌و، دەبێ ئەو کردو کۆششەمان لەبەرچاوبێ‌و ڕێزو تەقدیرمان بۆیان هەبێ.

هەروەها ئەهلی تەصەووف، بەڵێ ئێمە تێبینیمان هەیە لەسەر هەڵسوکەوتی هەندێك لەوانەی کە لەبەرگی تەصەووفدان، بەڵام بێگومان ئەسڵی تەزکیە لایەنێکی گرنگی ئیسلام‌و تەصەووفیش بەشێکی گەورەی کە لەپووری ئیسلامە، هەرچەندە تەتەڵەو

لەبێژینگدانێکی باشیشی دەوێ، وەك لە کتێبی: (ڕێگای صالح بوون...)دا باسمان کردوە، شایانی باسیشە کە (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (مجموع الفتاوی)ی خۆیدا دوو بەرگی گەورەی هەیە بەناوی: (التصوّف والسلوك)، ڕەنگە خەڵکێك پێی سەیربێ، کە بڵێین: دەبێ (إبن تیمیة) وەك شێخێکی گەورەی طەریقەت تەماشا بکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە کتێبێکی بچووکی شێخ (عبدالقادر الگیلاني) ڕەحمەتی خوای لێبێ بەناوی (فتوح الغیب)ی لە (مجموع الفتاوی)دا شەرح کردوەو هەمووجارێ کە ناوی شێخی گەیلانی دێنێ دەڵێ: (قُدّسَ سِرُّهُ)، بەڵام دیارە شێخی گەیلانی هەرچەندە شێخی طەریقەت بووە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زاناو شارەزا بووە، دەگێڕنەوە کە جارێك مەلا موحەممەدی کۆیی (مەلای گەورە) باسی (شێخ عبدالقادر)ی گەیلانی دەکات و دەڵێ: مەلا (عبدالقادر) وای گوتوەو مەلا (عبدالقادر) وایکردوەو وا چووە، لێی دەپرسن: مەبەستت لە مەلا (عبدالقادر) کێیە؟ ئەویش دەڵێ: ئێوە پێی دەڵێن: (شێخ عبدالقادر)ی گەیلانی، ئەوانیش دەڵێن: باشە ئەدی شێخی طەریقەت نیە بۆچی تۆ پێی دەڵێی: مەلا؟ لە وەڵامدا دەڵێ: جا سەڵا لە عەقڵتان ئینسان هەتا زاناو مەلاو شارەزای شەریعەت نەبێ چۆن دەبێتە شێخ؟! تا نەزانێ شەریعەت چییەو چۆنەو تا خۆی بەڕێگا نەزانێ، چۆن

پێش خەڵکی دیکە دەکەوێو ڕێگا یان پێشان دەدات؟!([1]) بەڵێ (عبدالقادر)ی گەیلانی شارەزاو شەرعزان (فقیە) بووە، ئنجا توانیویەتی ئیرشادو ڕێنمایی خەڵك بکات، هەروەها زانای بەناوبانگ (إبن القیم الجوزیة) هەر لەوبارەوە کتێبی: (مدارج السالکین)ی هەیەو زانایانی دیکەی گەورەی ئیسلام شتی چاكو بەنرخیان دەربارەی تەزکییەو تەصەووف نووسیوە.

جا بەو پێیە کە باسم کرد، ئەهلی تەصەووفیش بەتایبەت ئەوانەی هەقی خۆیان داوەتێ، کاریگەریی زۆر باشیان بووە، بەڵام هەڵبەتە نابێ تەصەووفو تەزکیەش لە چوار چێوەی خۆی دەربچێ، واتە: نابێ لە شەریعەت دەربچێو نابێ وەك ئیسلامێکی سەربەخۆ دابنرێ، بەڵکو پێویستە وەك لایەنێكو بەشێك لە ئیسلام تەماشا بکرێ، بەهەمان شێوە سەلەفییەتیش لایەنێکە لە ئیسلامو قوتابخانەیەکی ئیسلامییە، نەك بگوترێ: هەرکەسێك لەوێدا نەبێ، یان هەرکەسێك سەر بە ڕێبازێکی تەصەووف نەبێ، ئەوە مسوڵمان نیەو بەشی بە بەهەشتەوە نیە، نەخێر گرنگ ئەوەیە حەقیقەتی تەزکیەی نەفس، یان حەقیقەتی شوێنکەوتنی ڕێبازی پێشینی چاك، لای ئەوکەسە هەبێ، نەك ناز ناو و ناوونیشانی صۆفییو سەلەفییو فلانو فیسار شت، وە گرنگ

---

[1]) وەك لەوبارەوە گوتراوە:

قد سلك الطريق ثم عاد    ليُخبر القومَ بما استفاد

ئەوەیە کارکردن بۆ ئیسلام لای ئەو کەسە هەبێ، نەك حەتمەن دەبێ سەر بە فلاَن لایەنی ئیسلامیی بێ، ئەوجار بە ئیسلامیی دابنرێ! هەر چەندە بێگومان گۆڕینو پاك سازیی‌و چاك سازیی کۆمەڵگا، بەبێ کاری ڕێکخراوەیی‌و ڕێك‌وپێك‌و بە سەروبەر، نە سەردەگرێ‌و نە بەردەگرێ‌و، هەرکەسێك پێچەوانەی ئەوە بیر دەکاتەوە، نە لە دین تێگەیشتوەو نە لە ژین، وە ئەگەر تەمەنی بەردەوام بێ، درەنگ یان زوو حاڵی دەبێ کە حاڵی نەبووە!

**خاڵی حەوتەم:** هیچ کام لە پێکهاتەکانی تەوژمی ئیسلامیی لە هەڵەو کەم‌و کووڕیی‌و کرچ‌و کاڵیی خاڵیی نین:

چونکە کاتێك ئێمە دەڵێین: (کۆمەڵی ئیسلامیی) یان فلاَن لایەنی ئیسلامیی، هەندێك کەس وادەزانن کە ئێمە دەڵێین: فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵەین! نەخێر بەڵکو کێ زیاتر کار بکات، زیاتر ئەگەری تووشبوونی هەڵەی هەیەو، ئەو کەسە هەڵە ناکات کە هیچ ناکات! وە پێشینی چاکی ئێمە ڕەحمەتی خوایان لێبێ ڕەخنەیان لە یەکدی گرتوە، بۆ نموونە: ئەبووبەکرو عومەرو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، تێبینییان لەسەر کاروباری یەکدی‌و لەسەر بۆچوونی یەکدی هەبووە.

بۆیە نابێ هیچ کەس چاوەڕێ بکات کە لایەنێکی ئیسلامیی، یاخود ڕەوتێکی ئیسلامیی، هەڵەو کەم‌و کووڕیی نەبێ‌و بەومەرجە قبووڵی بێ! بەڵێ ئێمە ئینسانین هەڵە دەکەین‌و دەبێ

یەکدی شمان بەهە ڵەوە ڤ بووڵ بێ، بەڵام دوای ئەوەی بۆ مان دەردەکەوێ فلان شتەمان هەڵە یە، نا بێ لە سەری بەردەوام بین، هۆی سەرەکی ڕاجیایی (اختلاف)یش لە کاری ئیسلامییدا ئەوە یە کە کاری ئی سلامیی شێوازەکانی ج یاوازن‌و، لە کاتێ کەوە بۆ کات یك‌و لە چاخێکەوە بۆ چاخێك‌و لە ژینگەیە کەوە بۆ ژینگە یەك دە گۆڕین، وە لە گەڵ بەرەوپێش چوونی زەما ندا گۆڕانکاری یان بە سەردادێ، کەوا تە: زۆر دەر فەت‌و مەجالی ڕاج یایی‌و ئیجتیهاد یان تێدا یە، ئیجتی هادیش پێ کان (الإ صابة)و نەپێکان (خ طأ)ی تێدا یە، بۆ یە پێغەم بەری خوای ﷺ لە فەرمای شتێکدا فەرموو یەتی: ((إذَا اجتَ هَد ا لحَاكِمُ فأَ صَابَ فَ لَهُ أَ جْرَانِ، وإِذَا اجتَ هَدَ فأَخْ طأَ فَ لَهُ أَ جْرٌ)) (رواهُ البُ خاري برقم: (7353)، ومُ سلم برقم: (4462)، وأَ بوداود برقم: (3574)، وابن ماجه برقم: (2314) عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاص)، وا تە: ئە گەر حوکمڕان‌و فەرمانڕەوا ( یان هەر شەرعزان‌و شارەزایەك) ئیجتی هادو کۆش شی کرد﴿و ب یری کردەوە بۆ بڕ یاردان لە سەر شتێك کە دە قی شەرعیی لە سەر نەبوو﴾، ئە گەر پێ کای، دو پاداشتی هەن، ﴿پادا شتی کۆ شش کردن‌و پادا شتی پێکانە کەی﴾، وە ئە گەر نەیپێکا پادا شتێکی هەر هە یە،﴿ پادا شتی خۆ ماندووکر دنەکەی﴾.

- لێرەدا گومانێك دروست دە کرێ گوا یە لایە نە ئی سلامییەکان

بە شێوەیەکی گشتی لە جیهانی ئیسلامییدا توانای ئەوەیان نییە خۆیان ئیجتیهاد بکەن‌و دەڵێن ئەو فەرموودەیە نایانگرێتەوە؟

* نەخێر ئەوە وانییە، ناگونجێ ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ بەگشتی خاڵی بێ لە زانایانێك، کە دەتوانن لە قورئان‌و سوننەت تێبگەن، بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ:﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾ القمر، واتە: وە بێگومان قورئانمان ئاسان کردوە بۆ لێتێگەیشتن، جا ئایا کەس هەیە بێ لێی تێبگات؟ پاشان دەڵێین: ئەوە کێیە دەرگای ئیجتیهادی داخستوە؟ ئاشکرایە دەرگایەك خوا بیکاتەوە بە خەڵك داناخرێ، بۆیە لە ڕاستیدا ئەو قسانە وانین‌و ئەوەی بڵێ: مسوڵمانان توانای ئیجتیهادو کۆششیان نیە، دەیەوێ دین لە ژین بەجێ بمێنێ، لێرەدا ناوی کتێبێکی زانای ناودار ( جلال الدين السيوطي)م هاتەوە بیر ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کتێبێکی هەیە لە بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی نکوولیی لەوە دەکەن زانایانێك هەبن بتوانن ئیجتیهاد بکەن، بە ناوونیشانی: (الرَّدُّ عَلَى مَنْ أخْلَدَ إلى الأرض وجَهِلَ أنَّ الإجتهادَ في كُلِّ عَصْرٍ فرْض)، واتە: بەرپەرچدانەوەی کەسێك کە خۆی بە زەوییەوە نووساندوەو هەڵخزاوەو، نکوولیی لەوە دەکات کە لە هەموو سەردەمێکدا ئیجتیهاد فەرزە! ئینجا ئەگەر لایەنێکی ئیسلامیی زانای وای تێدا نەبوو ئیجتیهاد بکات، با

کەسانێکی دەرەوەی ئەو لایەنە ئیجتیهادی بۆ بکەن، ئەدی نابێ ئێمە تەواوکەری یەکدی بین؟! گرنگ ئەوەیە لەسەر مسوڵمانان فەرزە بە پێی توانا بۆ مەسەلەو بابەتە تازەکان بتوێژنەوەو ئیجتهاد بکەن، وە لە نێو مسوڵمانانیشدا هەمیشە زاناو شارەزایان و لێکۆڵەرەوانێك هەر دەبن، کە بتوانن باش لە قورئان و سوننەت تێبگەن و بۆ مەسەلەو بابەتە تازە پەیدابووەکانی سەردەمی خۆیان بڕیارو حوکمی نوێ لە قورئان و سوننەت هەڵبهێنجن.

مەبەستم ئەوەیە هەندێ کەس هەر کە بینییان لایەنێکی ئیسلامیی یاخود کەسایەتییەکی ئیسلامیی هەر مەشرەب و مەسلەکێکی هەبێ، هەڵەیەکی کرد یەکسەر کوتك و دەهۆڵی لێ دەست دەدەنێ، کە ڕەنگە هەڵەش نەبێ، بەڵکو بە میزاجی ئەو کەسە هەڵەبێ، کە بێگومان نابێ وابێ، چونکە تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ جاری وا بووە ئیجتیهادی کردووەو نەیپێکاوە، بۆ وێنە: دەربارەی مۆڵەت پێدانی ئەوانەی داوا مۆڵەتیان کرد کە نەچن بۆ جەنگی تەبووك، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾ التوبة، واتە: خوا لێت ببوورێ (ئەی موحەممەد ﷺ) بۆ ئەوانەی کە هاتن داوای مۆڵەتیان کرد ﴿کە نەچن بۆ جەنگی تەبووك﴾

دەر فەتت پ ێدان؟ ڕێگەت پێ نەدابان تا بۆت دەردە کەوێ کێ ڕاست دەکاتو لەگەڵت دێ، کێش درۆ دە کات هەر دە یەوێ خۆی بەپاش بدات.

یان دەر بارەی دی لەکانی جەنگی بەدر، خوای پەروەردگار دە فەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ...﴾ (٦٧) وَمَنَ الأنفال، واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلی هەبن، هەتاوەکو ئەهلی کوفر بە تەواویی زە بوون نەکاتو لە پەلوپۆیان نەخات، ئەو کاتە بۆی هەیە (ئەگەرنا لە کاتێکدا کە ئەهلی کوفر یاخیو دە ستدرێژکارن وا با شە د یل ڕانەگ یرێن) مەبە ست ئەوە یە کە جاری وا بووە پێغەمبەریش ﷺ لە ئیجتیهاددا نەیپێکاوە، چ جای غەیری ئەو، بەڵام د یارە هی پێغەمبەر ﷺ خوای کاربەجێ بۆی ڕاست کردۆتەوە، بۆیە ئێستا لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەوەی بە سەنەدێکی ڕا ست (صحیح) بۆ ئێمە جێگیر (ثابت) بووە، کە ئەوە هی پێغەمبەرە ﷺ، بەبێ دوو دڵیی وەر یدەگرین کە وەحیی پارێزراوی خوای پەروەردگارە، چونکە ئە گەر ئیجتیهادێکی کرد بێو نەیپێکابێ، وەك باسمان کرد، خوا (سبحانه و تعالى) بۆی ڕاست کردۆتەوە.

<u>بنە ماى هە شتەم:</u> <u>هەبوونی ناوونیشانو چوار چێوە بۆ کارو</u>

## چالاكی گرفت و نوقسانیی نیە:

بەڵێ گر فتو نوق سانی گەورە لەوەدا نـ یە كە لا یەنێكی ئیـ سلامیی هەبێو ناوونیـ شانێكی هەبێ، ڕەوتێ كی سەلەفیی هەبێو ناوونیشانێكی هەبێ، زا ناو پێ شەوایەك هەبێو كۆ مەڵێك قو تابی بەدەورەوە بن، شێخێكی طە ری قەت هەبێو كۆ مەڵێك موریدو مەنسووبی بەدەورەوە بن، مادام بە ڕێ بازی شەریعەتدا بیانـ بات، یاخود كۆ مەڵێك مامۆ ستا هەبنو بۆ وێـ نە: ( یەكێتی زانایان)ێك پێكبهێنن، یاخود كۆمە ڵە زانا یەك لیژنـە یەكی فەتوا پێكبهـ ێنن، وەك لە سعوودیەو ئەورووپاو شوێنانی دیـ كە هە یە، بەڵكو كێشەو گرفتو نوقسانی لەوەدایە كە ئەو باز نـە بـ چووكانە كە كاری ئیـ سلامیی پێوی ستی دە كات درو ستیان بـ كەین، بۆ ڕێكخستنی كاروبار لە چوارچێوەی بازنەكاندا، بیانكەیـ نە بنا غەی دۆستایەتیو دوژمنا یەتیو، بیانكەیـ نە چوار چێوەیەكی ئا سنینو بڵێیـن: هەر چی لەم چوار چێوەیە دا بێ ئەوە باشو پە سەندەو، ئەوەی لە دەرەوەی بازنەكە بێ بەكەڵك نا یەت، بێگو مان ئا ئەوە كێشەو گرفتە، جا چ لایەنێكی ئیسلامیی ئەوە بـ كات، هەر هە ڵەو نوقسانییەو، چ سەلەفییەكو سۆفیی یەكو مەلا یەكیش بیـ كات، هەر هەڵەو نوقـ سانییەو، هەركە سێك ئەو چوار چێوەو بازنـە یەی كە بارودۆخ پێوی ستی دە كات هەیبێتو پە یدای بـ كاتو، ئەو ناوونیشانو لافیتەیەی كە دروستی دەكات، دەمارگیریو (تعَصُّب)و

حیزبگەرایی (تحَزّب)ی بۆی هەبیّ و بیکاتە بناغەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی، ئەوە کارێکی هەڵەو ناشەرعیی دەکات و، ئەلێرەدا کێشەو گرفت پەیدادەبیّ و مسوڵمانان تووشی لێك دابڕان دەبن!

بیستم کە هەندێك کەس بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕەوایەتی بوونی لایەنە ئیسلامییەکان ئەم ڕستە قورئانییەیان بەکارهێناوە، کە خوادەفەرمویّ: أَحۡسَنُ...وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ وَمَنۡ ا ـلروم، واتە: وە لە هاو بەش پەیداکەران مەبن، ئەوانەی کە دینەکەیان بەشبەش کردو بوونە دەستە دەستە، هەر کۆمەڵ و دەستەیەك دڵخۆشە بەوەی، کە خۆی لەسەریەتی.

ڕاستە ئەوە عادەتی هاوبەش پەیداکەرانە، کە دینی خۆیان بەش بەش دەکەن، بەڵام بێگومان مسوڵمانانیش ئەگەر دینەکەیان پارچە پارچە بکەن، بۆ وێنە: سەلەفیی بڵیّ: بەس من لەسەر هەقم و، سۆفیی بڵیّ: ئەوەی بەرێی مندا نەیەت ناچێتە بەهەشت، وە هەروەها کۆمەڵی ئیسلامیی و یەکگرتوو بزووتنەوەو هەر لایەنێك و کەسایەتی و بانگخوازێکی ئیسلامیی، ئاوا بکات و ئەوە عادەتی بیّ، بێگومان ئەوە شوێنی هاو بەش دانەرانی هەلگرتووە: ڕاستە شەقامی ئیسلامیی بزر کردوە، کە تایبەتمەندیی ترین خەسڵەتی بریتییە لە خوا بە یەکگرتن و

یەکڕیزی (التوحید والوحدة)!

- ماموٚستا ئاموٚژگاریت یاخود تێبینیت بوٚ ئەو کەسانە چییە، کە لەوانە یە هەبن لە نێو هەر ڕەوتێکی ئیسلامییدا بەو شێوەیەی باست کرد بیردەکەنەوە؟

* جارێ من دەڵێم: بوٚ بەرەو پێش بردنی کارو پڕوٚژەی ئیسلامیی، هەبوونی ئەو ناوونیشانو چوار چێوانە پێویستە، ئایا دەگونجێ مسوڵمانان هەموویان لە یەك چوارچێوەدا ڕێك بخرێن؟ دیارە نەگونجاوەو ناگونجێ، ئایا ئەو خەڵکە هەمووی ئیجتیهادو بوٚ چوونی وەك یەکە بوٚ کاری ئیسلامیی‌و بوٚ چاککردنی ئەو واقیعەو بوٚ لە خوا نزیکخستنەوەی خەڵك؟ نەخێر، چونکە مەشرەبو سەلیقەی جیاجیا هەن، دەی با شەئەوانەی کە هاومەشرەبو هاوفیکرن، با چوار چێوەیەك بوٚ خوٚیان دروست بکەن، بەڵام با چوار چێوەکان بە چوار چێوەی کار دابنێن، نەك چوار چێوەی دین، وە با ئەو کوٚبوونەوە یە لە خوٚیان نەکەنە بناغەیەك بوٚ دوٚستایەتی‌و دوژمنایەتی! بوٚیە لە وەڵامی پرسیارەکەتدا دەڵێم: لەجیاتی: ﴿كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ٣٢﴾ الروم، واتە: هەر کوٚمەڵە بەوەی کە خوٚی لەلایەتی دڵخوٚشە یا ئاوابێ: (كُلُّ حِزبٍ بِمَا لَدَيهِم وَلَدَى غَيْرِهِم مِنَ الخَيْرِ فرِحُون) یا ئاوابین، مسوڵمان دەبێ بەکاری چاکی خوٚی دڵخوٚش

بێو، بە کاری چاکی هەر براو خوشکێکی دیکەی مسوڵمانیشی دڵخۆش بێ، باشە ئەگەر لە کوردستانی ئێمەدا برایەکی سەر بە یەکگرتوو، بزووتنەوە، ئەهلی تەریقەت، سەلەفیی، زانا یەك‌و مامۆستایەکی مزگەوت، کە سایەتیەکی ئیسلامیی، کارێکی باش دەکات، کتێبێکی باش دەنووسێ، وتارێك پێشکەش دەکات‌و دەرسێك دەڵێتەوە، خولێکی بەسوود دەکاتەوە، خەڵکێك لەسەر دەستی هیدایەتی وەردەگرێ، بۆچی دەبێ دڵم پێی خۆش نەبێ؟ بێگومان ئەگەر ڕاست بکەم لەگەڵ خواو بۆ دینی خوا دڵسۆزبم، دەبێ دڵم بەکاری هەموو مسوڵمانێك خۆشبێ، بە ئەندازەی ئەوە کە هەقی تێدا دەبینم‌و کەڵك‌و سوودی بۆ ئیسلام‌و مسوڵمانان تێدا دەبینم.

ئنجا لێرەدا پێم خۆشە لەوبارەوە قسەیەکی (شيخ الإسلام ابن تيمية) ڕەحمەتی خوای لێبێ، بێنمەوە دەربارەی بەکارهێنانی ناوونیشان، دەڵێ: ((بل الأسماء التي قد يَسُوغ التسميّ بها مثل انتساب الناس الى إمامٍ: كالحنفي والمالكي والشافعي والحنبلي، أو إلى شيخ: كالقادري والعدويّ ونحوهم، أو مثل الإنتساب إلى القبائل: كالقيسي واليمانيّ، وإلى الأمصار: كالشاميّ والعراقيّ والمصري، فلا يجوز لأحد أن يمتحن الناس بها...)) (مجموع الفتاوى بەرگی (3) لاپەڕە (416)، واتە: بەڵکو ئەو ناوانەی کە دروستە بکرێنە ناوونیشان، وەك ئەوەی خەڵك خۆی پاڵدەدا تە لای ئیمامێك،

وەك: حە نەفیی، مالیکیی، شافیعیی، حەنـ بەلیی، یان خۆی پاڵبدا تە لای شێخێکی ڕێ بازی تە صەووف، وەك: قادریی، عەدەویی، یان بۆلای هۆزو تیـرەیەك وەك: قەیسیی، یەمانیی، یان لای شارێك، وەك: شامیی، عێراقـ یی، میـ سریی، گرنگ ئەوە یە لە سەر ئەو شتانە تاقی نەکرێ تەوە، (وا تە: نەگوترێ: هەر چی هاومەز هەبو هاوڕێ بازو هاومە شڕەبو هاو شارو هاوهۆزی من نەبێو لە بازنەی مندا نەبێ بەکەڵك نایەت!)

**بنەمای نۆ یـەم: جۆرە کانی کارو چالاکی ئیـ سلامیی تەواو کەری یەکدینو هیچ کامیان جێدار (بەدیل)ی ئەوی دیکە نیە:**

بۆ وێ نە: لە زانـ ستە شەرعییەکاندا، زانـ ستی توێژیـ نەوەی قورئان (عـ لم التفـ سیر) جـ ێدار نـ یە بۆ زانـ ستی فەرموودەنا سیی (عـ لم ا لحدیث)، وە زانـ ستی چاك خوێند نەوەی قورئان (عـ لم التجو ید) جـ ێدار نـ یە بۆ زانـ یاری ئیـ مانو عەقـ یدە، وە زانـ ستی شەرع (فـ قە) جـ ێدار نـ یە بۆ زانـ یاری دەر بارەی مێژووو...هـ تد،

هەرکامێك لەوانە ڕۆڵی تایبەتی خۆی دەبینێ، بە هەمان شێوەش لایەنو ڕەوتە ئیسلامییەکانیش با هەریەکە کاری خۆی بکات، بەڵام کارەکەیان وەك تیپێکی وەرزشی بێو هەرکامیان دان بە خێری ئەوی دیکەیاندا بێنێو دەستبار بۆ یەکدی بگرن، بەڵام تۆ بڵێی: کاری ئیسلامیی هەر ئەوەیە کە من دەیکەمو ئەوی دیکە هیچی هیچ نیە! بەڕاستی ئەوە قسەو هەڵوێستێکی جاهیلانەیە.

- مامۆستا شێخ (ناصرالدین الألباني)ش ڕەحمەتی خوای لێبێ قسەیەکی لەم بابەتەی بەرێزت دەکات.

* بەڵێ دەبێ هەموو مسوڵمانێکی عاقڵ ئەوە هەڵوێستی بێ، چ جای زانا یەکی پایە بەرزی وەك شێخ ئەلبانی خوا لێی خۆشبێ.

**بنەمای دەیەم: لەنێو هەر کۆمەڵو دەستەیەکدا خەڵکی بە ئینسافو دادگەر هەیە، وە خەڵکی کرچو کاڵیش هەیە:**

بەڵێ لەنێو لایەنە ئیسلامیەکاندا، لەنێو ڕەوتی سەلەفییدا، لەنێو ئەهلی طەریقەتدا، لەنێو زانایانو مامۆستایانی مزگەوتدا، لەنێو هەمووا ندا، خەڵکی هاوسەنگو بە ئینسافی هەیە، کە دادگەرانە مامەڵە دەکات، وە پێچەوانەی ئەوانەش هەیە، بۆیە ڕەوا نیە ئێمە حوکم بە سەر لایەنێکدا، یان بە سەر ڕەوتێکدا

بدەین، هەر لەبەر ئەوەی چەند کەسێکی ئەو کۆمەڵو ڕەوتە وا دەڵێنو هەڵوێستیان ئاوا یە، خوای داد گەر دەر بارەی ئەهلی کتێبیش دەفەرموێ: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾ آل عمران، کەواتە: تەنانەت چ جوولەکەو نەصرانییەکانیش نابێ بەیەك چاو تەماشا بکرێنو ئەوانەی کە پابەندن بە دینەکەیانەوەو بە ئینسافن دوایی مسوڵمان دەبن، جیاوازن لەوانەی کە بێ ئینسافنو هەر لە سەر دینە شێوێندراوەکەی خۆیان دەمێننەوە، بگرە زۆر جار بەویشەوە پابەند نین.

**خاڵی یازدەیەم وکۆتایی: <u>ئێمە لە واقیعی ئەمڕۆی هەرێمی کوردستانو واقیعی جیهانی ئیسلامیشدا، لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە برایەتیو تەبایی و یەکدی خۆشویستنو ڕێز لە یەکدی گرتنو هاوکاری یەکدی کردن، هەیە:</u>**

بەڕاستی من زۆر زۆرم پێ ناخۆشە کۆمەڵە مسوڵمانێك، یان لایەنێکی ئیسلامیی، یان کەسایەتییەکی ئیسلامیی، هەموو

ئیشوکاری ئەوەبێ، دژایەتی خەڵکێکی دیکەی مسوڵمان بکاتو هەوڵبدات ناشیرینی بکاتو ناوی بزڕێنێ، بەڕاستی ئەو ڕەفتارە زۆر دوورە لە شەریعەتو لە عەقڵو لۆژیك، وە زۆریش دوورە لە بەرژەوەندیی دنیاو قیامەت، ئاخر تۆ چ بەرژەوەندییەك بەدەست دێنی، کە خوشكو برای مسوڵمانت ناشیرین دەکەی! یان ئەو چ بەرژەوەندییەك دێنێتەدی بە ناشیرین کردنت؟! باشە بۆچی یەکدی چاك نەکەینو جوان نەکەین؟ بەڵێ خۆ هەڵەو کەموکووڕیی لە یەکدی دەبینینو ناڵێم هەر دەبێ دەست بۆ یەکدی لە سەر سینگ دابنێین! بەڵام وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((المُؤمِنُ مَرآةُ المُؤمِن)) (رواه أبوداود برقم: ([illegible])، والبيهقي في سننه برقم: ([illegible])، وحسَّنهُ الألباني في السلسلة الصحيحة، برقم: ([illegible])، با ئاوێنەی یەکدی بین و هەڵەو کەموکووڕیی یەکدی چارەسەر بکەین، نەك کوتكو دەهۆڵ لە یەکدی دەست بدەینێ، ئاخر ناوی یەکدی زڕاندنو یەکدی تۆمەتبارکردن، جگە لە دوژمنانی ئیسلامو ناحەزانی ڕەوتی ئیسلامیی، هیچ کەس لێی بەهرەمەند نابێو دڵی پێی خۆش نابێ.

جا بەڕاستی ئەو جۆرە کەسانەی کە ئیشیان ناو زڕاندنی مسوڵمانانو زەمو غەیبەت کردنیانە، بزانن یان نەزانن، ئاو بە ئاشی دوژمنو ناحەزانی ئیسلامدا دەکەن، جا چ لە لایەنێکی

ئیسلامییدا بن، یان لە هەر دەستەو پێرێکدا بن، هەرکەسێك برا یەتیو دۆستایەتی مسوڵمانانی نەکاتو مافی برا یەتییان لەگەڵ جێبەجێ نەکات، بەڕاستی بیەوێو نەیەوێ خزمەتی ئامانجەکانی دوژمنو ناحەزانی ئیسلام دەکات.

من ئەو چەند بنەما گشتییەم بەپێویست زانی بیانخەمە ڕوو، کە پێم وایە ئەوانە خاڵی هاوبەشی هەموو پێکهاتەکانی تەوژمی ئیسلامیین، هی هەموو ئەو دڵسۆزانەی کە دەیانەوێ دینی خوای پەروەردگار کاڵای باڵای ژینی ئەم خەڵكو میللەتەبێ.

- بەڵێ مامۆستا بەپێی ئەو خاڵانەی بەڕێزتان ئاماژەت پێکردن کاری ئیسلامیی لەم ڕۆژگارەدا پێویستەو دەبێ مسوڵمانان پێکەوە کۆببنەوە، هەرکەسە بەپێی تواناو پسپۆڕیی خۆی بەم کارە هەڵسێ، بەڵام دیسان لێرەدا گومانو دڵەڕاوکێیەك دروستکراوە کە دەگوترێ: ئیسلام فەرمان دەکات بە یەکڕیزییو پێکەوەژیان، بەڵام ئایا دروستبوونی فرەلایەنیو بوونی ئەم هەموو لایەنە ئیسلامییە، نابێتە پەرتەوازەییو دووبەرەکیی؟!

* وەك ئاماژەم پێکرد ئەوەی دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی بریتیە لە دەمارگیریی کوێرانەو دانەهێنان بە فەزڵو چاکەی یەکدیداو، بریتیە لە قۆرخکردنو تاپۆکردنی حەق لەسەر خۆت، ئیمام شافیعی جوانی گوتوە: ((رَأْيِي صَوَابٌ يَحْتَمِلُ الخَطأَ ورأيُ

غیـري خَطـأٌ یَحْتـملُ الصَّواب))، واتـە: بۆچوونی خۆم پێ ڕاستەو ئە گەری هەڵەبوونیشی هە یە، وە بۆ چوونی بەرانبەرە کەم پێ هەڵەیەو ڕێی تێدەچێ ڕاستیش بێ!

د یارە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە چاوپۆشیی (تسامح) پەیدا دەکات، بۆیە دەڵێین: پەرتەوازەیی لەوە پەیدا نابێ، کە چەندان لایەنو ڕەوتی ئیسلامیی هەبن، مادام پێکەوە دۆستو تەبابنو مافەکانی دۆستایەتییو برایەتیی (الموالاة والأخوّة) لەگەڵ یەك بپارێزن، بەڵکو پەرتەوازەییو دووبەرەکێ لەوە پەیدا دەبێ، کە یەکێك لەو لایەنو ڕەوتانە بڵێ: هەق هەمووی لەسەر من تاپۆ کراوە! ئاخر ئەگەر مەبەست لە هەق قورئانو سوننەت بێ، ئەوە هەموومان تێیدا بەشدارین، بەڵام ئەگەر مەبەست لە هەق، پێکان (إصابة) بێ لە بۆچوونو تێگەیشتن دەر بارەی چەند مەسەلەیەك، ئایا ماقووڵە بڵێی: خوای پەروەردگار هەر منی خستۆتە سەر ڕێبازی هەقو پێکان (إصابة)ی بەس بە من بەخشیوەو خەڵکی دیکەی هەموو لێ مەحرووم کردوە؟! دیارە کەسێك ئاوا بیربکاتەوە، ئەوە بە پێچەوانەی قسەی ئیمام شافیعیو پێشەوایانو پێشینی چاکمان، دەڵێ: بۆ چوونی من ڕاستەو ناشگونجێ هەڵەبێ، بۆچوونی بەرانبەرەکەشم هەڵەیەو ناشگونجێ ڕاستبێ، کە ئەمەش هەمان قسەی فیرعەونی موو سایە (علیە السلام)، کە دەیگوت: أَحْسَنُ...مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ

أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَمَنۡ غافر، واتە: تەنیا ئەو ڕایەتان دەخەمە بەردەست کە خۆم پێم باشەو منیش تەنیا ڕێی ڕاستتان پێ شان دەدەم!! وە بیگو مان ئا ئەو بیرکردنەوە یە دەمارگیریی (تعَصُّب) پەیدا دەکات، جا هی لایەنێکی ئیسلامیی بێ، یان سەلەفیی یەك، یان سۆفیی یەك، یان مەلا یەك، یان هەرکەسێك!

ئنجا ئەو قسەیە کە دەڵێ: لایەنە ئیسلامییەکان دەبنە هۆی پەرتەوازەیی، لەڕاستیدا ئەوە قسەیەکی فەقیرحاڵانەیە، ڕەنگە پێیان وا بێ ئێستا ئێمە ئۆمەتێکی ئیسلامیی یەکگرتوومان هەیەو دەسەڵاتێکی یەکگرتوومان هەیە، شەریعەت کاڵای باڵایەو، خەڵك لەژێر سایەو سێبەری شەریعەتدا بەڕێوە دەچێ، بەڵام لایەنە ئیسلامییەکان دەیانەوێ ئەو خەڵکەی لەژێر سایەو سێبەری شەریعەتو سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامدا کۆبوونەتەوە پەرتەوازەو بەش بەشیان بکەن!! ئایا ئەوە وایە؟! نەخێر براله وانیە، بەڵکو ئێستا مسوڵمانان وەك ڕانە مەڕێکیان لێهاتوە کە لە شەوێکی باراناویی تاریکدا گەلە گورگ بەنێویان دەکەوێ‌و، ئێستا هەر مسوڵمانەو بەدەم گورگێکی عەلمانییەوە چووەو، هەریەکە بەدەم حیزبێکی دوور لە ئیسلامەوەیە، هەر مسوڵمانەو لەلایەن دەستەو تاقمێکی عەلمانییەوە بەکاردەهێنرێ‌و (إستغلال) کراوە، بێ ئەوەی بەخۆ شی بزانێ! بەڵام لایەنە ئیسلامییەکان دەیانەوێ مسوڵمانانی پەرش‌وبڵاو

کۆبکەنەوە، نەك بمانەوێ مسوڵمانانی تۆکمەو پێکەوە جوٚشدراو لێك بلاو بکەینەوە، ئایا ئێستا مسوڵمانان پەرش وبلاوو بێ سەروبەرن، یان تۆکمەو جوٚشدراوو توندو تۆڵن؟!

- مامۆستا ئەو گومانە دەوروژێنرێ، کە باشە لەنێو میللەتو کۆمەلگایەکی مسوڵماندا پارتو لایەنی ئیسلامی بۆچی؟

* بۆ ئەوەی کە دە بێ کە سانێك هەبن پێش ئەو خەلکە بکەون، کەواتە ئەدی لەنێو کورددا حیزبی کوردییمان بۆ چییە؟ یان لەنێو نەتەوەو نیشتمانندا، حیزبی نەتەوەییو نیشتیمانییمان بۆ چییە؟! ئەوە جۆرێکە لە چەواشەکاریی، جا ئەوانەی هەبوونی لایەنە ئیسلامییەکان بە هۆکاری پەرتەوازەیی دەزانن، بیستوومە چەند ئایەتێکی قورئان بە بەلگە دێننەوە، بۆ وێنە کە خوا (عزّ و جلّ) دەفەرموێ: أَحْسَنُ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ... ﴿١٠٣﴾ وَمَنْ آل عمران، واتە: (ئەی بڕواداریینە!) هەمووتان دەست بگرن بە ڕێسمانی خواوەو پەرتەوازە مەبن، بەلام دەڵێین: باشە خۆ لایەنە ئیسلامیەکانیش هەر ئەوە کاریانەو خەلك بانگ دەکەن بۆ دەستگرتن بە قورئانو سوننەتەوەو دەیانەوێ ئەو خەلکەش کە بەدەم گورگی حیزبە عەلمانییو نائیسلامییەکانو بەدەم گورگی دز یا خۆرانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواوەیە، ئەوانەش بێننەوە بۆ باوەشی ئیسلام، بۆ

دەستگرتنەوە بە ڕێسمانی خواو بە قورئانو سوننەتەوە!

یان ئەم ئایەتە بەبەڵگە دێننەوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ...﴾ (١٥٩) وَمَنْ الأنعام

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئایینەکەیانیان پەرتەوازە کردووەو بوونە تاقم تاقم تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە، ڕاستە، خۆ خوای کاربەجێ ڕاستی فەرمووە، بەڵام ئایا ئەوە کەی بەسەر لایەنە ئیسلامیەکاندا دەچەسپێ؟! خوا دەفەرموێ: ئەوانەی دینەکەیان بەش بەش کردووەو بوونە تە پار چە پار چە، ئەوە تۆ هیچ پەیوەندییەکت پێیانەوە نیە، جارێ دەڵێین: ئەم ئایەتە لەبارەی هاوبەشدانەرەکانەوە هاتوە، پاشان ئایا منێکی ئیسلامیی یان کەسێکی سەلەفیی، یان سۆفیی یەك، یان مامۆستاو زانایەك، یان بانگخوازو نووسەرێك، هەمووومان هەر ناڵێین: با بگەڕێینەوە بۆ قورئانو سوننەت؟! وە هەمووومان ناڵێین: وەرن با هەمووومان پابەند بین بە ئیسلامەوە؟! دەی باشە بۆ چیو بە عەقڵو ویژدانێك، دەگونجێ ئەو تۆمەتە نارەوایە پاڵبدرێتە لای لایەنە ئیسلامییەکان؟! نەخێر بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لەم ڕۆژگارەدا ئیسلام لە مەیدانی ژیانو گوزەرانی وەلا نراوەو فەرامۆش کراوە، وەکە سانێك لە مسوڵمانان لەخشتە براونو ئیستیغلال کراونو، ئێمەی ئیسلامییش دەمانەوێ خەڵکی لە دەورەی ئیسلام کۆبکەینەوەو بیانهێنینەوە مەیدانو،

مسوڵمانانیش ببنە خاوەنی بوونو قەوارەی خۆیان لەژێر سایەی ئایینەکەیا نداو، چیدی نەچەو سێنرێنەوەو کلاو یان لە سەر نەنریٚو بەگژ یەکدیدا نەکرێن!

ئن جا لەڕاستییدا لە هەرێمی کوردستانو عێراقو لە هەر شوێنێکی دیکەی دنیادا، بەرهەمو پەرێزو شوێنەواری کاروچالاکی لایەنە ئیسلامییەکان زۆر بەرچاوە، هەڵبەتە من لێرەدا، وەك لە سەرەتای قسەکانیشمدا ئاماژەم پێکرد، مەبەستم تەنیا (کۆمەڵی ئیسلامیی)، یان ئەو چەند لایەنە ئیسلامییە نیە، بەڵکو هەر سەلەفییو سۆفییو[1] مەلاو کە سایەتییەکیش، کە لە چوارچێوەی شەرع دەرناچن، من هەموو ئەوانە بە خاوەن پشكو بەش دەزانم، لەم گەشەکردنی حاڵەتە ئیسلامییەو لەم ڕابوونو هۆشیاریيو بێدارییە ئیسلامییەدا! جا لێرەدا با بیهێنینە پێش چاوی خۆمان: ئایا ئەگەر ئەوانە هیچی نەبوونایە، خەڵك چی لێدەهات؟ کێ خەڵكو جەماوەری هۆشیار کردبایەوە؟ ئەگەر مامۆستاو تاربێژان نەبان، کە ڕاستییەکانی ئیسلام بۆ خەڵك ڕوون دەکەنەوە، وە لایەنە ئیسلامییەکان نەبان، کە هەزاران

---

[1]) وشەی (صۆفی) مەبەستم پێی شوێنکەوتووانی طەریقەتو تەصەووفە بەگشتی، نەك تەنیا شوێنکەوتووانی طەریقەتی نەقشبەندیی، وەك لە کوردستاندا باوەو بە شوێنکەوتووانی طەریقەتی قادریی دەڵێن: دەروێش، چونکە لە ئەسڵدا وشەی (صۆفی) گشتگیرە بۆ شوێنکەوتووانی سەرجەم طەریقەتەکانی تەصەووف. 

گەنجیان پەروەردە کردوە، وە هەموو ئەوا نە نەبوونا یە کە بەرگریی لە ئیمان‌و عەقیدەو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، بێگو مان وەزعە کە زۆر دە شێوا، کەوا تە: مادام بەرهەمە کەی دەبینین بۆچی ئینکاریی لێدەکەین؟!

# ئاڵـقــەی دووەم

- بەڵێ ماموٚستا دیارە لە ئاڵقەی پێشوودا ویستمان باسی وشەی (حزب الله) بکەین کە لە قورئاندا هاتوە، بەڵام لە بەر کەمیی کاتە کەمان نەمانتوانی، جا ئێستا فەرموون با لەوێوە دەست پێبکەین:

* بسم الله الرحمن الرحيم الحمد لله و صلى الله تعالى و سلم وبارك على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه (ربنا آتنا من لدنك رحمة وهيء لنا من أمرنا رشدا).

شایانی باسە کە وشەی: (حزب الله) لە قورئانی موبارەکدا سێ (3) جار هاتوە: جارێك لە سوورەتی (المائدة)و دوو جاریش لە سوورەتی (المجادلة)دا، سەرەتا با سەرنجی ئەو جارەیان بدەین کە لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوە، بەڵام دەبێ لە پێشدا سەرنجی دوو ئایەتی پێشوتری بدرێ کە پێکەوە پەیوەستن، چونکە تو ێژەرەوانی قورئان کردوویانە بە بنچینە (قاعدة) بۆ لێتێگەیشتنی وشەو ڕستەکانی قورئان، کە پێویستە وێڕای خودی خۆیان، سەرنجی سیاقی ئایەتەکانی پێشووترو دواتریش بدرێ، سەرنجی هەمووی بدرێ، ئنجا زیاترو چاکتر تێدەگەی کە ئەو

وشەو زاراوەیە بە چ واتایەك بەكارهاتوە، یان ئەو ڕستەو بڕگە یە چەمك‌و واتایەكەی چۆنە؟!

خوای كار بەجێ لە سووڕەتی (المائدة)دا دە فەرموێ: أَحۡسَنُ

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ

وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ

وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾

إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ

وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ

هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ وەمن، وا تە: ئەی ئەوا نەی بڕوا تان هێ ناوە! هەركامێكتان لە ئایینەكەی پاشگەز بێتەوە، ئەوە خوا كەسانێك دێنێ كە خۆشی دەوێن‌و خۆشیان دەوێ‌و لەسەر بڕواداران نەرم‌و میهرە بانن‌و لە سەر كافران تو ندو بەدەمارن، لە ڕ ێی خوادا تێدەكۆ شن‌و لە لۆ مەی لۆمە كاران بێبا كـن ئا ئەوە بەخش شی خوایە دەیداتە هەركەسێك كە بیەوێ وە خوا فراوانیی زانایە.

بێگو مان دۆ ست‌و پ شتیوانتان تەنیا خواو پێغەمبەرە كەی‌و ئەوانەن، كە ئیمانیان هێناوە، ئەوانەی نوێژ بەرپادە كەن‌و زە كات دەدەن‌و هەمیشە ڕكووع دەبەن.

وە هەرکە سێك دۆ ستایەتیی خواو پێغەمبەرە کەی‌و ئەوا نە بکات کە ئیمانیان هێناوە، ئەوە هەر ئەوانە زاڵ‌و سەرکەوتوون.

وەك دەبینین ئەم وشەی (حزب الله)یە، کە لێرەدا بەکارهاتوەو کراوە بە ناوونیـشانی: ((کۆ مەڵی هەڵبژاردەی خوا)) کە خوا (سبحانە و تعالی) باسی دەکات‌و دەفەرموێ: هەر ئەو کۆمەڵی خوایە زاڵ‌و سەرکەوتوون، دوای ئەوە هاتوە کە خوای زاناو توانا ڕوو لە بڕواداران دەکات‌و دەفەرموێ: ئەی ئەوانە بڕواتان هێناوە! هەر کامێك لە ئێوە لە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوە، ئەوە خوا کۆمەڵێك (یاخود کەسانێك) دێنێ، کە ئەو شەش سیفەتەیان تێدان:

1/ ﴿يُحِبُّهُمْ﴾، خوا ئەوانی خۆش دەوێ.

2/ ﴿وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾، ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ.

3/ ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، لە سەر بڕواداران زەلیل‌و نەرم‌و میهرەبانن.

4/ ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾، لە سەر کافران سەخت بە عیززەت‌و بە دەمارن.

5/ ﴿يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن.

6/ ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾، وە لە لۆمەی لۆمەکاران

ناترسن.

أَحۡسَنُ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ وَمَنۡ ، ئا ئەوە بەخشێی خوا یە دەیدات بە هەرکە سێك کە بیەوێ، وە خوا فراوانی زانا یە، (واتە: بەخششو سیفاتەکانی خوا - عزّ و جلّ- فراوانو بێ سنوورن، وە خوا زانا یەو دەزانێ ئەو بەخشە بێوێنەیەی خۆی بە کێ دەدات)

لێرەدا خوا (سبحانه و تعالی) باسی شەش سیفەت دەکات بۆ کەسانێك، کە دوای ئەوەی خەڵك لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوە، خوا ئەو کەسانە کە خاوەن ئەو سیفەتانەن دێنێو دینی خۆیان پێ دەبوژێنێتەوە، ئەو سیفەتانە چین؟

یەکەم: أَحۡسَنُ يُحِبُّهُمۡ وَمَنۡ ، خوا خۆشی دەوێن، جا ئایا خوا کێی خۆشدەوێ؟ خۆ خوا (تبارك و تعالی) کەسی بە گۆترە خۆش ناوێ، کەواتە: با سەرنجی قورئان بدەین:

أَحۡسَنُ ...وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَنۡ آل عمران، وە خوا خۆڕاگرانی خۆشدەوێن.

أَحۡسَنُ ...فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ وَمَنۡ آل عمران، ئەوە خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن.

أَحۡسَنُ ...إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَمَنۡ البقرة، بێگومان خوا

چاکەکارانی خۆشدەوێن.

أَحْسَنُ ... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ وَمَنْ آل عمران، بەڕاستی خوا پشت پێبەستووانی خۆشدەوێن.

أَحْسَنُ ... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ وَمَنْ البقرة، بێگومان خوا زۆر گەڕاوانی خۆشدەوێن، وە خۆ پاککەرەوانی خۆشدەوێن.

أَحْسَنُ ... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَمَنْ المائدة، بێگومان خوا دادگەرانی (یان بەخشەرانی) خۆشدەوێن.

کەواتە خاوەنی ئەم سیفاتانەن: (صَبْر، تَقْوى، إحْسان، توَكُّل، تطهر، قسط) بۆیە بوونەتە خۆشەویستی خوا.

دووەم: أَحْسَنُ وَيُحِبُّونَهُۥ وَمَنْ، ئەوانیش خوا یان خۆشدەوێ، بەڵام کێ خوای خۆشدەوێ؟ ئەمیش قورئان ڕوونی کردۆتەوە: أَحْسَنُ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ وَمَنْ آل عمران، بەڵێ: ئەگەر خوات خۆشبوێ، دەبێ بەدوای خۆشەویستی خوا بکەویو شوێن پێی هەڵبگری، کە پێغەمبەری خوایە ﷺ وە لە ئەنجامی ئەوەشدا خوا (سبحانە و تعالی) تۆی خۆشدەوێ.

سێیەمو چوارەم: أَحْسَنُ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ وَمَنْ،

له سەر بڕواداران زەلـ یلو میهره بانن، وا تە: لەڕووی بیّدە سەلاّتیی و زەبوونیـ یەوە نـ یە، بەڵکو لەڕووی ڕە حمو شەفەقەتو لێبوردنو چاوپۆشیی یەوەیە، کە لە گەڵ بڕواداران میهرەبانو گەردن کەچنو نەرمو به ڕە حمن، وەك لە ئا یەتی (29)ی سووڕەتی (الـ فتح)یـ شدا دە فەرمویّ: ﴿رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ﴾، وا تە: لە نـ یّو خۆیا ندا بەڕەحمو بە بەزەیین، هەروەها له سەر کافران سەختو پـ تەوو بە دە مارن، کە بە هەمان شێوە لە هەمان ئا یەتی پێـ شووی سووڕەتی (الـ فتح)دا دە فەرمویّ: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ﴾، کە هەمان وا تای توندیی و پتەوییو بە دەماریی دەگە یەنیّ، کە د یارە مەبە ست پێی حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوەو بەرەنگارییە.

پێنـ جەمو شە شەم: ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٍ﴾، لە پێـناوی خواو ئایـینو ڕێبازەکەیـدا (بە سەرو ماڵ) تێدەکۆشنو لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسن.

کەوا تە یەکێك لە سیفەتەکانی ئەوا نەی بە (حزب الله) ناودەبرێن، ئەوەیە کە لەنێو خۆیا نداو لە گەڵ ئەهلی ئیـمان بە ڕە حمو شەفەقەتو میهره بانو لێ بوردەن، وە لە گەڵ نەیارو بێبـڕوایانـدا ڕەقو بە دەمارو زبرن، کەواتە: دەبیّ هەر کامـێك لە ئێـمە زۆر وریا بیّو شتەکە پێـچەوانە نەکا تەوە، وەك لە شیعرە

عەرەبییەکەدا هاتوە، دەڵێ: (أسدٌ عَلَيَّ وعلَى الأعداءِ نَعامةٌ)، واتە: لە گەڵ خۆم وەك شێرە، کە چی لە بەرانبەر دوژمنان دا وەك حوشترمەل وایە! کە بەڕاستی ئەوە حەیفە! دەبێ لە گەڵ ئەهلی ئیماندا بە ڕەحم و لێبوردەو میهرەبان بیو، ئەگەر سەختیی و ڕەقیی و دەمارو عیززەت و شیددەتت هەیە، لە کات و شوێنی خۆیدا لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا بەکاری بێنە!

بەڵێ دوای ئەوە ئینجا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ﴾، واتە: ئەی خاوەنی ئەو سیفەتانە! پێویستە تاقە پشتیوان و دۆستی ئێوە خوابێ، پاشان پێغەمبەر بێ ﷺ لە حاڵی حەیاتی خۆیدا، وە دوایی ڕێو شوێن و ڕێبازەکەی بێ، وە بڕواداران بن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەدەن و بۆ خوا گەردن کەچیی دەکەن، ئینجا دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾، واتە: هەرکەسێك دۆستایەتی (تولّي) خواو پێغەمبەری خواو ﷺ بڕواداران بکات، ئەوە کۆمەڵی خوا (حزب الله)یەو، کۆمەڵی خواش زاڵن بەهۆی خۆ ڕازاندنەوەیانەوە بەو خەسڵەت و سیفەتانەوە.

لە سووڕەتی (المجادلة) شدا بە هەمان شێوە کە باسی کۆمەڵی خوا ( حزب الله) دەکات دوو جار و شەی ( حزب الله) دووبارە

دەکاتەوە، ئەویش دوای ئەوەیە کە دەفەرموێ: أَحَسَنُ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓاْ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾ وَمَنْ المجادلة، واتە: هیچ کە سێکت دە ستناکەوێ بڕوای بە خواو ڕۆژی دوا یی هەبێ‌و دۆستایەتیی کەسانێك بکات کە دژا یەتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، با ئەو کەسانەش بابیان، یان کوڕیان، یان برایان، یان خزم‌و عە شیرەتیان بن، ئەوا نە خوا ئیـ مانی لە دڵیا ندا چەسپاندوەو بە ڕووحێك لە لایەنی خۆیەوە پشتگیریی کردوون، وە دەیا نخاتە چەند باغێ کەوە ڕووبار یان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیـ شەیی تێیا ندا دەمێنـ نەوە، ئا ئەوا نە کۆ مەڵی خوان، ئاگاداربن! هەر کۆمەڵی خوا سەرفرازن.

کەوا تە: ئا ئەو جۆرە کە سانە کۆ مەڵی خوا ( حزب الله)ن، بەڕا ستی ئێمە هەر بەوە کار مان پـێك نا یەت کە بڵێـ یـن: ئێـمە کۆمەڵ‌و تاقمی خواین، ئێمە (حزب الله)ین، نەخێر دە بێ سەرنج بدەین، بزاـ نیـن دۆ ستانی خواو کۆ مەڵی خوا، وە کۆ مەڵی مـ سوڵمانان، ئەوا نەی لە سەر ڕێ بازی پێغەمـ بەری خوان ﷺ

سیفەتەکانیان چ ین؟! دە بێ ئەو سیفەتانە لە خۆما ندا بهێنیـ نەدی، ئەو کا تە ئە گەر بەدەمی خۆ شمان باس نە کەین ز یانی نـ یە، ئە گەرنا ئێ مە و یردی سەر زما نمان ئەوەبێ، کە بڵێیـن: ئێمە لە سەر ڕێ بازی پێ شینەی چاك (السلف الصالح) ین، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خواین ﷺ و ئێمە کۆ مەڵی دەر بازبوو (الفرقة الناجية) ین، بێگو مان بە قسە پ ێك نا یەتو نابـ یـن بە هیچ، ئەگەر سیفەتەکانیان لە خۆماندا نەیەنینەدی!

- مامۆستا دەر بارەی (أو لي الأ مر) کە لە سوورەتی (النساء)دا هاتوە دە فەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ... ﴿٥٩﴾﴾ النساء، وەك جۆر ێك لە گو مان درو ستکراوە، جا ئا یـا ئەم (أو لي الأ مر)ە هەموو کاربەدە ستو فەرمانڕەوا یـەك دەگرێ تـەوە؟ ئەو کە سە حو کـم بە بەرنا مەو شەریعەتی خوا بکات، یان حوکمی پێ نـەکات، کەسێکی خراپ بێ یاخود باش بێ؟

* برای بەڕێزم! بۆ ئەمیش دیـسان دەبـێت تەما شای سیاقی ئایە تەکانی پێش ئەو ئایە تە بـ کەین، پێش ئەو ئایە تەی کە جەنابت سـەرەتاکەیت خوێ ندەوە، خوای دادگـەر دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ وەمن دەبێ باش سەرنجی ئەو دوو ئایەتەو ئایەتەکانی دوایش بدەین، ئنجا تێدەگەین (أولي الأمر) کێن، تەماشا دەکەین خوا (سبحانە و تعالی) سەرەتا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات بە گشتی دەفەرموێ: خوا فەرمانتان پێدەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە ئەگەر حوکمو دادوەرییتان لەنێوان خەڵکدا کرد دادگەرانە حوکم بکەن، بێگومان ئەوەی خوا ئامۆژگاریتانی پێدەکات باشترین شتە، بەڕاستی خوا بیسەری بینەرە، (واتە: قسەکانتان دەبیستێو کردەوەکانتان دەبینێ) پاشان دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەنو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، وە هی کاربەدەستانێك کە لەخۆتانن، جا ئەگەر لە شتێکدا کەوتنە مشتومڕەوە، ئەوا بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر، ئەگەر بڕواتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، بێگومان ئەوە باشترەو سەرەنجامی چاکترە.

(شیخ الإسلام إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ، کتێبێکی هەیە بەناوی (السیاسة الشرعیة في إصلاح الراعي والرعیة) وە ئەو کتێبەی خۆی لەسەر ئەم دوو ئایەتە بینا کردوە، کە

توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: لە ئایەتی یەکەمدا خوای پەروەردگار کە دەفەرموێ: أَحْسَنُ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ...وَمَنْ ئەوە ڕوو دەکا تە بڕواداران بە ( مـحكوم)و بە ( حاكم)ەوە، بە خەڵك و میلەتو حوکمڕانانەوە، فەرمان بە خەڵك دەکات، کە سپاردەکان (الأمانات) بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، هەڵبەتە چەمکی (أمانة) سپاردە گشتییە، بەڵام لێرەدا بەپێی سیاقی ئایەتەکان دەردەکەوێ، کە مەبەست لە سپاردە بەرپرسێتیو حوکمڕانییو برا گەورایەتییە أَحْسَنُ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّواْ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَمَنْ، خوا فەرمانتان پێ دەکات کە سپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان.

بەڵێ لێرەدا پێش هەموو شتێك مەبەست سپاردەی حوکمڕانییە، چونکە ئەگەر سپاردەو ئەمانەتی حوکمڕانیی گەیشتە ئەهلی خۆی، سپاردەو ئەمانەتەکانی دیکەش هەموویان باش دەپارێزرێن، مادام سپاردەی حوکمڕانیی بەدەستی کەسێکی شیاوو شایستەوەبێو حوکمڕانییەکی دادگەرانە بکات، بێگومان سپاردەکانی دیکەش دەپارێزرێن! بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: ((إذا ضُيِّعَتِ الأمانةُ، فانتظرِ السَّاعَةَ، قال: كيفَ إضاعتها؟ قال: إذا وُسِّدَ الأمْرُ إلى غَيْرِ أهْلِهِ فانتظرِ السَّاعَةَ)) (رواهُ البُخاري برقم: (59) عَنْ أبي هُرَيرَة)، واتە: هەر کاتێك سپاردە زایەکرا چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بکەن، گوتی

بەزایەدانی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: هەرکاتێك کاروبار (وشەی - الأمر- لە قوڕئان‌و سوننەتدا بەواتای کارو باری سیا سیی‌و کۆمەلایەتی دێ) بە خەڵکی غەیری ئەهلی خۆی (ناشایستە) سپێردرا چاوەڕێی قیامەت بکە. دیارە لێرەدا مەبەست قیامەتی گەورە نیە، بەڵکو مەبەست قیامەتی ئەو کۆمەڵە یاخود ئەو شوێنەیە، کە بێگومان ئەوە دەربڕینێکی زۆر وردە، واتە: هەر کۆمەڵ‌و نەتەوەیەك کاروباری بەڕێوەچوونیان لەنێو خۆیاندا بە کەسانێکی ناشایستە سپێردرا، ئەوە چاوەڕێی قیامەتیان بکەن، اتە بێگومان وەزعەکەیان تێکدەچێ‌و کۆتایی پێ دێ!

جا خوای کار بەجێ لە ڕستەی یەکەمی ئایەتەکەدا ڕووی دواندن (خطاب) لە موسوڵمانان دەکات، وەك خەڵك‌و جەماوەرو دە فەرمویّ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا﴾، واتە: خەڵکینە! سپاردەکان ـ بەتایبەت سپاردەی حوکمڕانیی‌و کارو بار بەڕێوەبردن ـ بگێڕنەوە بۆ خەڵکی شایستەی خۆیان، ئنجا لە بڕگەی دووەمدا ڕوودەکاتە حوکمڕان‌و کاربەدەستان‌و دە فەرمویّ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾، واتە: ئەی حوکمڕان‌و کاربەدەستەکان! دوای ئەوەی خەڵك ئێوەی هەڵبژاردو ئەمانەت‌و سپاردەی حوکمیان دایە دەستی ئێوە، ئێوەش دادگەرانە حوکم بکەن لە نێوان خەڵکدا، کەواتە: لەم ئایەتەمو بارەك‌و بەپیّزەدا خوای کار بەجێ بە شێوەیەکی

تێکهەڵکێش‌و ئاوێتە هەرکام لە خەڵك‌و جەماوەرو حوکمڕانان دەدوێ نیَ، چونکە لە واقیعیشدا هەروا یەتێکەڵن‌و لە یەك جیانین.

ئنجا دوایی لە ئایەتی دووەمدا کە وەڵامی پرسیارەکەمانە، دەفەرمویَ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾، (دەبیَ ئاوا لە ئایەتەکان تێبگەین)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن ﷺ وە هی کاربەدەستانێك‌و شوورخۆرانێك کە لە خۆتانن، لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: خوا فەرمانی کردوە بە فەرمانبەریی کردنی خوا (جل شأنه)، واتە: پابەندیی بە قورئانەوە، پاشان فەرمانی کردوە بە فەرمانبەریی کردنی پێغەمبەر ﷺ، واتە: پابەندیی بە سوننەت‌و ڕێبازی پێغەمبەرەوە، ئنجا لە قۆناغی سێیەمدا دەفەرمویَ: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ﴾، بەڵام وشەی ﴿وَأَطِيعُواْ﴾ی دووبارە نەکردۆتەوە، بۆ چی؟ چونکە ئێمە پابەند (مُلزَم) ین بەدوای قورئان بکەوین، دوای قورئانیش پێویستە پابەندبین بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ، واتە: بە شێك لە وەحیی خوا لە قورئاندا بەرجەستەیەو، بەشەکەی دیکەشی لە سوننەتدا بەرجەستەیە، وەك لە فەرمایشتێکدا هاتوە: ((ألاَ إنّي

أُوتـ يـتـُ الكـ تـابَ ومثـ لـَهُ معَ ـهُ)) (رواهُ أ بوداود برقم: (4604)، و صححهُ الأل باني في سل سلة الـ صحيحة برقم: 2870، وا تە: بزانن! من قورِ ئانم پ ێدراوەو وەك قورِ ئانيش شتێكى دی كەم پێدراوە (كە سوننەتە)، ئاشكرايە كە كۆمەڵێك ياسا لە سوننەتى پێغەمبەردا ﷺ هاتوون لە قورِئا ندا نەهاتوون، جگە لەوەى كە سوننەتى پێغەمـ بەر ﷺ مو جمەلى قورِ ئان ڕوون دەكا تەوەو، چۆنيەتى پراكتـ يزەو پ يادەكردنى قورِ ئان ڕوون دەكا تەوە، هەنديك ياساشى تێدان كە لە قورِئا ندا نە هاتوون، بەڵام غەيرى قورِ ئان‌و سوننەت بۆ ئێ مە پابەند كەر (مُ لْزِم) نـ يەو بەدين لەقە لەم نادرێ، وەك لە ئالاّ قەى پێ شوودا با سمان كرد، بەڵكو كاربەدەستانى ئێمە بە ئەندازەى ئەوە كە لە خۆ مانن پابە ندن بە قورِ ئان‌و سوننەتەوە، فەرماذ بەرييان لە سەرمان پێوي ست دەبێ‌و گوێڕايەڵيى كردنمان بۆيان واجب دەبێ، بۆيە دە فەرموێ: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، و شەى (أو لي) وا تە (أ صحاب) ئنـ جا (أو لي الأ مر) وا تە: (أ صحاب الأ مر) ئەوا نەى كە خاوەنى حەقى حوكمڕانيين، جا ئايا كێن خاوەنانى ئەو حەقە؟ خوا دە فەرموێ: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾ الـ شورى، وا تە: كارو بارى مـ سوڵمانان لەنێو خۆيا ندا بە ڕاو ێژە، كەوا تە: كە سانێك دەبـ نە خاوەنى مافى حوكمڕانيى، كە مـ سوڵمانان بەپرس‌و ڕاو ڕاو ێژى خۆ يان هەڵياذ بژاردوون، جا د يارە لە سەردەمى پێغەمبەرى شدا

ﷺ وابووه، له هەر شوێنێك دەقی قوڕئانو سوننەت نەبووبێ، كە فلاّن كەس بەرپرسە، مسوڵمانان گەڕاونەتەوە بۆ ڕای خۆیانو بیروبۆچوونی خۆیان، كێیان پێ چاك بوو بێ دایاندناوە، وە هەر چوار جێنشینە سەر ڕاستەكانیش بەڕای مسوڵمانان دا نراون، بۆیە پێشیان گوتراوە: (الخلفاء الراشدون)، لەدوای ئەوانیش بۆیە دەگوترێ: پادشایەتی بە ددان گیراو (الملك العضوض) یان (الملك الجبري) پادشایەتی جەبریی، چونكە بەزۆر خۆیان سەپاندوە، یاخود بە میراتیی بووەو بە شێوەیەكی ناشەرعیی چوونەتە سەركار!

لێرەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: أَحْسَنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ وَمَنۡ وەك دەیبینین، نەیفەرموە: (و لي الأ مر) بەڵكە فەرمووە یەتی: (وأو لي الأ مر)، چونكە لەنێو مسوڵماناندا لە بواری حوكمڕانییدا تەنیا یەك كەس خاوەنی هەموو شتێك نییە! بەڵكو لە ئیسلامدا دەبێ نوێنەرو مشوورخۆرانی مسوڵمانان كە بە (أهل الحل والعقد) ناوبراون، كاربەدەستو حوكمڕانانی خۆیان دیاری بكەن، ئەهلی حەللو عەقدیش بریتین لە زانایانی ئیسلامو سەركردەو فەرماندەكانو قسە ڕۆیشتووانو متمانە پێكراوانی لای خەڵك(□)،

□) لە زنجیرە وتاری: (ئیسلامو دەوڵەتداریی و حوكمڕانی)دا كە لە بەرنامەی

کە د یارە لەلا یەن خەڵك و جەماوەرەوە هەڵدە بژێردرێن و متما نەیان پێدەدرێ، وە تەنیا کە سانێك دەکرێ نە حوکمڕان و کاربەدە ست، کە ئەوان پشتگ یرییان ب کەن و هەڵیانبژێرن و ئەمانەتی حوکمڕانییان پێ بسپێرن.

ئنجا لێرەدا پر سیارێك دە کرێ: ئەدی با شە ئە گەر ناکۆکیی پەیدا بوو لەنێوان حوکمڕانان و خەڵکدا، ئەو کا تە چی دە کرێ؟ خوا (عزّ و جلّ) دە فەرموێ: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾، وا تە: جا ئە گەر ناکۆکیی تان کەو تە نێوان، بیگێڕ نەوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، وا تە: بۆ لای قورئان و سوننەت، کەواتە: حوکمڕان و کاربەدە ستانی مسوڵمانان، دەگو نجێ مسوڵمانان لەگەڵیا ندا بکەو نە کێ شەوە، بەڵام کێ دادوەرە؟ بێگومان قورئان و سوننەت.

کەوا تە: هەر کەس ڕا ست بۆوە بە (ولي الأمر) و بە (أولي الأمر)ی مسوڵمانان دانانرێ! بەڵکو دەبێ لە خۆیان بێ و خۆیان دایان نابێ، وە ئا مادەش بێ ئە گەر لە گەڵیان کەو تە کێ شەو مشتومڕەوە، قورئان و سوننەت بکاتە دادوەرو پێوەر، ئەدی (ولي الأمر) و کاربەدە ست و حوکمڕانێکی عە لمانیی کە هەر لە

---

(سەرنج) و لە کەناڵی ئاسمانیی پەیام دا پێشکەشیان دە کەم، ئەم مە سەلەیەو سەرجەم باس و بابەتەکانی دەوڵەتداریی باش دەتوێژرێنەوە.

بنەڕەتەوە دان بە قورئان‌و سوننەتدا نەهێنێ!؟ بێگومان ئەوە هەرگیز بە کاربەدەست‌و بەرپرس‌و مەشوورخۆری مسوڵمانان‌و ئەهلی ئیمان لەقەڵەم نادرێ!!

- مامۆستا گیان سەبارەت بە ڕۆژگاری ئەمڕۆ، لەنێو جیهانی ئیسلامییدا بە شێوەیەکی گشتی، مسوڵمانان دەتوانن گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەری کێ بن؟

* ئایەتەکە زۆر ڕۆشنە کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، ئێمە پێش ئەوەی بە قسەی خەڵك بکەین بە قسەی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەین، پێش هەموو شتێك دەبێ بەرنامەی ژیان دابنێین، کە بەرنامەکەمان قورئان‌و سوننەتە، چونکە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ واتە: پابەندیی بە قورئان‌و سوننەتەوە، ئنجا فەرمانبەریی ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ﴾، کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن، واتە ئەو حوکمڕان‌و مەشوورخۆرانەی، کە دەبێ لەژێر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا هەڵبژێردرێن‌و پابەندیش بن بە قورئان‌و سوننەتەوە، چونکە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾، یانی ئەگەر بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە فەرمانبەرو گوێڕایەڵی خوا

پێغەمبەرو ﷺ حوکمڕان و کاربەدەستانێکی بڕوادار بن کە لەخۆتانن، شایانی باسیشە و شەی أَحۡسَنُ مِنكُمۡ وَمَنۡ و یڕای بەرجگرتنی ئیمان و ئیسلام لە حوکمڕان و کاربەدەستاندا، ئەوەشی لێ دەفامرێتەوە کە دەلێ بەویستو خوا ستو ڕەزامەندیی خەڵکیش بووبنە حوکمڕان و دانرابن، نەك بەزۆر خۆیان سەپاندبێ! چونکە حوکمڕان و کاربەدەستێك بە بەشێك و ئەندامێکی کۆمەڵگای مسوڵمان دادەنرێت، کە:

1- بەپێی ئایین و بەرنامەی ئەوان بووبێتە حوکمڕان، دیارە تا کە ڕێی بوو نە حوکمڕان و ئەرك و بەرپرسیارێتی پێسپێررانیش لە ئیسلامدا، بریتیە لە ڕاوێژ وەك خوا (عزّ و جلّ) فەرموویەتی: أَحۡسَنُ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ﴿٣٨﴾ وَمَنۡ الشورى، واتە: وە کاروباریان لەنێو خۆیاندا بە ڕاوێژە.

2- هەرکات کەوتنە ناکۆکیی لەگەڵ کاربەدەستانیان لە شتێکدا، بۆ چارەسەرکردنی بگەڕێنەوە بۆ تەرازووی قورئان و سوننەت، کەواتە هەرکات حوکمڕان و کاربەدەستێك، یان خەڵك و جەماوەرێك، ئامادە نەبێ قورئان و سوننەت بکاتە دادوەرو بیکاتە پێوەرو تەرازوو، ئەوە مانای وایە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی نیە!

پاشان دەفەرموێ: أَحۡسَنُ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا وَمَنۡ، واتە:

ئەوەش چاکترەو سەرەنجامی باشترە بۆ ئێوە کە بەو شێوەیە بکەن، لە پێش دا فەرمانبەرییتان بۆ خواو کتێبی خوا بێ، پاشان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو سوننەتەکەی، ئنجا دوای ئەوە بۆ کاربەدەستانێك کە لە خۆتانن و هی خۆتانن و بۆ خۆتان دایاندەنێن، وە پابەندیشن بە دینەکەتانەوە، ئائەوا نەمشوورخۆری مسوڵمانانن و حوکمڕانانێکن کە مسوڵمانان لەسەریان واجبە بە قسەیان بکەن.

بەڵام بیستوومە هەندێك کەس گوتوویانە: هەرکەسێك دەسەڵاتی هەبوو دەبێ بە قسەی بکرێ! جا ئەگەر وابێ نەدەبوو نە ئیبراهیم ﷺ لە قسەی نەمروود دەرچووباو، نە مووسا ﷺ لە قسەی فیرعەون دەرچووباو، نە عیسا ﷺ لە قسەی ڕۆمەکان دەرچووباو، نە موحەممەد ﷺ لە قسەی ئەبووجەهل و زلەزلانی قورەیش دەرچووبا! ئەوە کەی قسەیە؟! نابێ ئەو قسەیە لەنێو مسوڵماناندا هەر بکرێ، ئەوە قسەیەکی زۆر بێماناو قەڵبە، ڕاست وەك ئەو قسەیە وایە کە دەڵێ: ( من اشتدت وطئته وجبت طاعته)، واتە: هەرکەسێك تواناو دەسەڵاتی زۆر بوو، پێویستە بەقسەی بکرێ بەڕاستی ئەو قسەو بۆچوونە، ڕاست پێچەوانەی قورئانە، ئەوەتا دەبینین دوای ئەوەی خوای باڵادەست ئیبراهیم دەکات بە پێشەوا بۆ خەڵك، وەك دەفەرموێ: أَحۡسَنُ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن

ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَمَنۡ البقرة، واتە: وە کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند وشە (فەرمان)ێك، جا هەموویانی تەواو کرد (یانی لە هەموو ئاوەکان پەڕیەوەو لە کڵ دەرچوو)، خوا فەرمووی: من دەمەوێ بتکەم بە پێشەوا بۆ خەڵك. (چونکە لە تاقیکردنەوەکانم دەرچووی بە کەڵکی پێشەوایەتی دێی). ئیبراهیم گوتی: ئەدی لە وەچەکەم؟ (واتە: ئەوانیش لە دوای من دەبن بە پێشەوا؟) (خوا) فەرمووی: أَحۡسَنُ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ وَمَنۡ، پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە!

بەڵێ، زاڵم شایستەی ئەوە نیە لەلایەن خواوە دیاری بکرێ بە پێشەوا بۆ خەڵك، چونکە ئەو بەکەڵکی خۆی نەهاتووە و نایەت، چۆن بەکەڵکی خەڵکی دێ؟!

کەواتە ئەوە قسەیەکی زۆر بێمانایە کە هەرکەسێك دەسەڵاتی بوو دەبێ بە قسەی بکەین، ئەدی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەر دژی خۆبەزلگەران (مستکبرین)و خۆشگوزەرانان[1] (مترفین)و زێدەڕۆیی کەران (مسرفین) نەبوون؟! دەبینین موو سایە بە گژ فیرعەون دا چووەو، ئیبراهیمەو بە گژ نەمردوودا چووەو، سالیحەو لە دژی زلەزلانی گەلی سەموود

[1]) مەبەست ئەوانەن کە لە سەر حیسابی خەڵكو بە پارەو سامانی حەرام ڕادەبوێرن، وەك بەرپرسە بێ دینە گەندەڵو مشەخۆرەکانی ئەم ڕۆژگارە!

ڕاپەڕیوەو، هوودەو لە بەرانبەر زلەزلانی گەلی عاد ڕاست بۆتەوە، دیارە کە پێغەمبەری ئێمەش ﷺ بەگژ ئەبووجەهل و سەرە زلەکانی قوڕەیشدا چووەو شۆڕشی لەدژ بەرپا کردووە.

کەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دوژمنی هەرە سەر سەختیان خۆ بەزلگران و فیرعەون و تاغووتەکان بوون، کەوابێ چ ڕەوای هەقە، ئێستا بەناوی ئیسلام و دینەوە کەسێك بلێین: هەرکەسێك دەسەڵاتی هەبوو دەبێ بەقسەی بکەین!! بەڕاستی ئەوە قسەیەکی زۆر بێما ناو هەتا بڵێی قەڵ بەو پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، جا لەوە سەیرتر ئەوەیە کە دەگوترێ: دەبێ ئەو جۆرە حوکمڕانە هەر بە قسەی بکرێ، مەگەر بۆ خۆی بڵێ: کافرم و دان بنێ بە کافرێتی خۆیدا! بۆچی و گەر کافرکەر (مکفّر) هەر ئەوەیە کابرا بە دەمی خۆی وابڵێ؟! ئەدی ئەگەر هەموو گیانی و هەموو هەڵسوکەوت و هەنگاو هەڵوێستی و ڕەوتەکەی، هەمووی بەرەو کوفرو فەسادو ئیباحییەت و بێدینی بێ، هێشتا دەبێ هەر بە دەم بڵێ: کافرم و بە زمان دانی پێدابێنێ، ئنجا بە کافری بزانی؟!

زانایانی ئیسلام کەی شتی وایان گوتوە؟! جگە لە تاقمی (مورجیئە) کە تاقمێکی لادەرو سەرلێشێواو بوون؟ نەخێر ئەمە وانیە، چونکە کوفر زۆر جۆری هەن و مرۆڤ بە زۆر شت کافر دەبێ و لە ئیسلام دەردەچێ: کوفری ئیعتیقادی هەیە، کوفری قەولیی هەیە، کوفری عەمەلیی هەیە، بەڵێ کوفر چەندان جۆرو

شێوەی هەن، کە زانایانی ئیسلام باسیان کردوە[1]، وە لەڕاستیدا ئەوە مورجیئەکانن کە لەم مەسەلەیەدا زۆر یان تێپەڕاندوەو بەزەحمەت کافران بە کافر دادەنێن، ئێمەش دەڵێین: بەڵێ نابێ مسوڵمان بە کافر دابنرێ، بەڵام خۆ دەبێ کافر بە کافر دابنرێ، ئەوە فیکرەی تەکفیریی یە، کە مسوڵمانان بە کافر دادەنێ، ئەگەرنا وەك چۆن بە کافر دانانی مسوڵمانان بە ناهەق و بەبێ بەڵگەی شەرعیی شتێکی ناڕەوا یە، بە هەمان شێوە بەکافر دانەنانی کافرانیش هەر شتێکی ناڕەوا یە، ئەویان تێپەڕاندوەو ئەمیشیان بەزایەی داوە.

کەواتە: کورتەی قسان لە مەسەلەی (أولي الأمر)دا ئەوە یە کە: کاربەدەست و حوکمڕانانێك مسوڵمانان خۆ یان هەڵیانبژێرن و پابەندیش بن بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، وە هەرکات کەوتنە کێشەو مشتومڕیشەوە ئامادەبن بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت و بیانکەنە تەرازوو دادوەر، ئائەوانە کاربەدەستان (أولي الأمر)ی مسوڵمانانن.

ئنجا لێرەدا بە پێویستی دەزانم ڕستەیەك لە تەفسیری (القاسمي) بێنمەوە، کە دەڵێ: (قال بعضُ أمراءِ بني أميّة لبعضِ التابعين: أليس اللهُ أمركم أن تطيعونا، في قوله: أَحْسَنُ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ

---

[1]) ئێمە لە بەرگی یەکەمی کتێبی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی..)دا بە درێژی ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە.

مِنكُمْ وَمَنْ ؟ فقال له: أليس قد نزعت عنكم يعني: الطاعة، إذا خالفتم الحقّ، بقوله: أَحْسَنُ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ وَمَنْ (□)، واتە: یەکێك لە کاربەدەستانی ئومەویی بە یەکێك لە زانایانی تابعین دەڵێ: ئایا خوا فەرمانی پێ نەکردوون کە بەقسەمان بکەن، کە دەفەرمویێ: أَحْسَنُ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ وَمَنْ ؟ (دەی کەواتە بە قسەمان بکەن ئێمە کاربەدەستو حوکمڕانین) ئەو زانایەش دەڵێ: ئەدی خوا مافی فەرمانبەریی بۆکرانی ئێوەی لە ئێوە وەرنەگرتۆتەوە، کە دەفەرمویێ: أَحْسَنُ فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ وَمَنْ ؟ (واتە جەنابی حوکمڕان با بگەڕێینەوە بۆ تەرازووی شەریعەت، جا وەختێك کە ئێوە ئامادەنین بچینەوە بۆلای تەرازووی شەریعەتی خوا، مانای وایە ئێوە ملکەچی شەریعەت نینو کە ملکەچی شەریعەت (قورئانو سوننەت)یش نین، کەواتە: ئێوە کاربەدەستانێك نین لە خۆمان، چونکە کاربەدەستانی خۆمان کەسانێکن ئامادەن ملکەچی شەریعەتو دینی خۆمان بن!)

- بەڵێ، بەڵام مامۆستا لێرەدا گومانێکی دیکە هەیە: ئەوانەی فەرمانبەرییکردنی کاربەدەستان بە شێوەیەکی ڕەها بە پێویست

---

(□) بڕوانە: (تفسير القاسمي) بەرگی □، ل (□□□-□□□).

دەزا نن لەم ڕۆژ گارەی ئەمڕۆما ندا، ئەو فەرمووده یە بەبەڵگە دێن نەوە کە عو بادەی کوڕی صامت گێڕاویە تەوە کە لە فەرموودەکەدا هاتوە: ((وَأنْ لاَ نُنَازِعَ الأمْرَ أهْلَهُ، إلاَّ أنْ تَرَوا كُفراً بَوَا حَاً...)) رواهُ البُ خاري برقم: (7056)، ومُ سلم برقم: (4745)، والنَ سائي برقم: (4160)، وا بن ما جه برقم: (2866).

* ڕا ستە، خۆ ئێ مە هەرکە سێك ئیـ سلام تە بەننیی بـ کات‌و شەریعەتی خوای وەك بەرنامەی ژ یان قبوولّ بێ، ئە گەر هە ڵەو لادان‌و کەم‌وکوڕییەکیشی هەبێ، ناچین سەنگەری لێ‌بگرین! بەڵام ئەدی کە سێك کە لە ئە سڵدا بڕوای بە ئیـ سلام نـ یەو دژ بە پیادەکردنی شەریعەتە؟! بێگومان ئەم فەرمایشتە هیچ پەیوەندیی بەو جۆرە کە سانەوە نـ یە، ئەوەی پێغەمـ بەری خوا ﷺ لەو فەرموودە یەدا ئا ماژەی پێ‌دە کات، ئەوە بە سەر دە سەڵاتدارانی ئو مەوییو عەبا سیی‌و عو سمانییدا دەچە سپێ، کە شەریعەتیان پـ یادەو تە بەننیی کردوەو ئیـ سلامیان وەك بەرنا مەی خۆ یان لەقە ڵەم داوە، بەڵام دوا یی لە حەقی نەفـ سی خۆ یان‌و خەڵکدا کەم‌و کوڕییی‌و هە ڵەو گو ناح‌و ستەم‌و لادانـ یان هەبووە، بەڵام بەگشتی بە ئیسلام ڕازی بوون کە بە بەرنامەی ژ یان‌و سیـ ستەمی حوکمڕانیی دابنرێ، بەڵام بێگومان: کاربەدەست‌و حوکمڕانێك کە لە ئە سڵدا بڕوای بە ئیـ سلام نـ یەو پـ ێی وا یە بە کەڵکی ئەم

سەردەمە نایەت، ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو زۆریش دژا یەتی دەکات! دیارە فەرمایشتەکە هیچ پەیوەندیی پێیانەوە نیە.

- مامۆستا گو مانێکی دیکە هە یە کە زۆر جار لە بەردەم کاری ئی سلامییدا قوت دەکرێ تەوە، ئەویش ئەوە یە کە گوا یە ئەم ڕێکخراوو لایە نە ئی سلامییانەی کە لەم ڕۆژ گارەدا درو ستبوون و هەن، هەموویان دەکەو نە بەر ئەو تاقما نە (ال فرق)ەوە کە لە فەرمووده یەکی پێغەمبەردا ﷺ ئا ماژەی پێ کراوە، جا ئا یا دەگو نجێ ڕێک خراوو لایە نە ئی سلامییەکانی ئەمڕۆ زاراوەی (الفِرَق) بەسەریاندا بچەسپێ؟

* دیارە فەرموودە کە بە چەند صیغەیەك هاتوە، یەکێکیان ئەمە یە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دە فەرموێ: ((إفْتَرَقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى وَسَبعِينَ فِرْقَةً، وافْتَرَقَتِ النَّصارَى عَلَى ثِنتَينِ وَسَبعِينَ فِرْقَةً، وستَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثلاثٍ وَسَبعِينَ فِرْقَةً، كُلُّهَا في النَّار إلاَّ وَاحِدَة، قِيلَ ومَنْ هِيَ يَارَسُولُ اللهِ ﷺ؟ قَالَ: ((مَنْ كَانَ عَلَى مِثْل ما أنا عَلَيهِ اليَوْم وأصحابي))، (وفي لفظ): هي الجَمَاعَةُ) (رواهُ أحمد وأبودارد برقم: (4596)، وابن ماجه برقم: (3992)، وغيرهم وصححه الحاكم والذهبي والعراقي وإبن حجر وابن تيمية، والألباني، رحمة الله على الجميع).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: جوولەکەکان بوو نە حەفتاو یەك تاقم، وە نەصرانییەکان بوونە حەفتاو دوو تاقم، ئۆمەتی

منیش دەبێتە حەفتاو سێ تاقم، هەموویان لە دۆزەخ دان، جگە لە یەکێکیان، گوتیان: ئەو کۆمەڵە کێیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کۆمەڵە یە کە لە سەر ئەو ڕێبازە یە، کە ئەمڕۆ من‌و هاوەڵانی منی لە سەرن، ( لە (لفظ)ێکی دیکە شدا هاتوە: ئەوانە کۆمەڵن (واتە: کۆمەڵی ڕاست‌و هەق).

لەم فەرمایشتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە بە ئەزموونی هەڵەی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات، کە جوولەکەکان بوونە حەفتاو یەك کۆمەڵ‌و نەصرانییەکان بوونە حەفتاو دوو کۆمەڵ لە دینداریی کردندا، چونکە ڕاست ئەوەیە کە ئێمە هەموو یەك کۆمەڵ بین، جا کە وەختێك ئەوان بوونە حەفتاو یەك‌و حەفتاو دوو، دە فەرموێ: ئۆممەتی منیش لە ڕووی بەرنامەی فیکریی‌و واقیعی سیاسییەوە دەبێتە حەفتاوسێ بەش، وە ئەوانە هەموویان لە دۆزەخ دان، یەکێکیان نەبێ، جا ئایا لێرەدا مەبەست لەوە چییە کە هەموویان لە ئاگری دۆزەخدان، ئایا ئەو هەڕەشەیە لایەنە ئیسلامییەکان دەگرێتەوە؟ هەڵبەتە من دوایی قسەی زانایانی لەسەر دێنمەوە، بەڵام ئێستا هەر بەکورتی دەڵێم: با بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن پێناسەی ئەو کۆمەڵە - کۆمەڵی ڕزگاربوو، سەرکەوتوو (الفرقة الناجية) - دەکات؟ دەفەرموێ: (( مَنْ كَانَ عَلَى مِثْل مَا أنا عَلَيهِ اليَوْمَ وأصحَابي))، کەواتە: هەر کەس‌و لایەنێك لە سەر ڕێبازو بەرنامەیەك بن کە پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی، خوا لێیان ڕازی بێ

لەسەری بوون، دیارە ئەوە لە کۆمەڵی سەرفرازو دەربازبوویە.

ئنجا دیارە پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزیشی لەسەر بەرنامەو ڕێبازی قورئان‌و سوننەت بوون، بۆیە هەرکەسێك لەلایەن‌و ڕەوتە ئیسلامییەکان‌و هەر تاکێکی مسوڵمان خۆی بە کردەوە وابێ‌و بانگی خەڵکیش بکات بۆ پابەندیی بە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ، مانای وایە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە لەسەر ڕێبازی هاوەڵانی بەڕێزی (أصحاب)و پێشینی چاك (السلف الصالح)ی ئۆممەتی ئیسلامە!

بەڵام گرنگ ئەوەیە تەماشا بکەین، بزانین ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی بەڕێزی چی بووە؟ ئا یا ڕێبازی ئەوان تەنیا سەرگەرمبوون بووە بە هەندێك مەسەلەو بابەتی عەقیدەوە؟ یان تەنیا سەرگەرمبوون بووە بەهەندێك بابەتی لایەنی تەزکیەی نەفسەوە؟ یان تەنیا خەریك بوون بووە بە لایەنی پەروەردەوە؟ یان تەنیا سەرگەرمبوون بووە بەلایەنی جەنگ‌و جیهادەوە؟ یان تەنیا خەریك بوون بووە بە لایەنی حوکم‌و سیاسەتەوە؟ یان تەنیا بە لایەنی بانگەوازەوە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانیی کە لە قورئان‌و سوننەتدا بەرجەستەیە، هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، کەواتە: دەبێ بزانین ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی چۆنە، ئێمەش ئاوا پابەند بین، ئەو کاتە ئەو چەمکی کۆمەڵ (الجماعة) کە لە ڕیوایەتێکدا

هاتوە، دەمانگرێتەوە، وە تەنیا ئەوکاتە ئەو کۆمەڵە دەبین کە لەسەر حەق‌و لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کۆبۆتەوەو چەمکی: ((مثل ما أنا عليهِ اليومَ وأصحابي))ی دەیگرێتەوە، ئنجا ئەوکاتە هەر ناوێکیش لەخۆی بنێ کێشەیەك نیە، ناوی حیزب بێ، یان سەلەفیی، یان زانایان، یان سەنتەرێك بێ، یان ڕێکخراوێك بێ، لە قالّبێکی سیاسیی دا بێ، یان کۆمەڵایەتی، گرنگ ئەوەیە مادام لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بێ، ئەو پێناسەیە دەیگرێتەوە، بەڵام کە بگوترێ: پارت‌و لایەنە ئیسلامییەکان لە کۆمەڵە پەرتەوازەکان‌و ئەهلی دۆزەخن، بێگومان ئەوە قسەو بۆچوونێکی قرپۆك‌و پووچەو، حوکمدانێکی بەتاڵ‌و بێ بەڵگەیە، چونکە دەبێ بپرسین: ئایا کۆمەڵ‌و تاقمە پەرتەوازەکان (الفرق) کێن؟ـ کە لە ڕیوایەتێکدا بە خاوەن ئارەزووەکان (أهل الأهواء) پێناسە کراون ـ لەڕاستیدا دەستەو تاقمە پەرتەوازەکان ئەوانەن کە لەڕاستە شەقامی پێغەمبەر ﷺو ڕێبازی ڕاستی ئیسلام دەترازێن‌و لادەدەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە کەسێك‌و لایەنێك لەسەر ڕاستە ڕێبازی پێغەمبەرو هاوەڵانی بێ‌و، لەسەر بناغەی قورئان‌و سوننەت کاربکات، مانای وایە لەو کۆمەڵ دەربازبوو و سەرفرازە لەقەڵەم دەدرێن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەدحی کردوون.

- مامۆستا هەروەها گومانێکی دیکە لەوەوە دروست بووە، کە لە فەرمودەکەی حوزەیفەدا هاتوە: (...فاعتزل تلكَ الفرق كُلها)،

واتە: جـا واز لەو تاقمانە گشتیان بێنـەو کەنـارگیـربە، ئەگەر بگونجێ بەڕێزتـان تیشکی بـخەنە سەر.

* ڕاستە ئەوەش هەندێك گومان و تەم‌ومژی لە دڵی هەندێك خەڵکدا دروست کردوە، سەبارەت بە لایەنە ئیسلامییەکان، جا من سەرەتا فەرموودەکە هەمووی دەخوێنمەوە، پاشان سەرنجی دەدەین، بزانین: ئایا بەهیچ جۆرێك دەگونجێ ئەوەی لێوەربگیرێ کە مەبەستی پێ کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەکان بێ، یاخود بە پێچەوانەوە؟! ئەمەش دەقەکەیەتی: (( عَنْ حُذَيفَة رَضِيَ الله تعالى عَنهُ قَالَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وَشَرٍّ فَجَاءَنَا اللهُ بِهذَا الْخَيْرِ فَهَل بَعْدَ هذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرٍّ؟ قَالَ النبي ﷺ: (نَعَمْ)، قُلْتُ فَهَل بَعْدَ ذَلِكَ الشَّرِّ مِنْ خَيرٍ؟ قَالَ: (نَعَمْ وفِيهِ دَخَنٌ)، قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: (قَوْمٌ يَهْدُونَ بِغَيرِ هَدْيِي وَيَستَنُّونَ بِغَيرِ سُنَّتِي، تَعْرِفُ مِنهُمْ وَتُنْكِرُ)، قُلْتُ: يَارَسُولَ اللهِ ﷺ فَهَل بَعْدَ هذَا الخَيرِ مِن شَرٍّ؟ قَالَ: (نَعَمْ، دُعَاةٌ عَلَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ، مَنْ أَجَابَهُمْ إِلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا)، قُلْتُ: يَارَسُولَ الله ﷺ: صِفْهُمْ لَنَا، قَالَ: ((هُمْ مِنْ بَنِي جِلْدَتِنَا وَيَتَكَلَّمُونَ بِأَلْسِنَتِنَا)) قُلْتُ: يَارَسُولَ اللهِ ﷺ فَمَا تَأْمُرنَا عِندَ ذَلِكَ؟ قَالَ: (تَلزَمُ جَمَاعَةَ المُسْلِمِينَ وإِمَامَهُمْ))، قُلتُ: فَإِنْ لَمْ يَكُن لَهُمْ جَمَاعَةٌ وَلاَ إِمَامٌ؟ قَالَ: ((فَاعْتَزِل تِلْكَ الفِرَقَ كُلَّهَا، وَلَوْ أَنْ تَعَضَّ عَلَى أَصْلِ شَجَرَةٍ، حَتَّى يُدْرِكَكَ المَوْتُ وَأَنتَ عَلَى ذَلِكَ)) (رواه البُخاري برقم:

(3606)، ومُسلم برقم: (4761)).

وا تە: حوزەیفەی کوڕی یەمان - خوا لێی ڕازی بێ- کە بە خاوەنی نهێنیە یەکانی پێغەمبەر ﷺ ( صاحب سرّ النبيّ) ناسراوە، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا کرد ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە نەفامییو خراپەدا بووین، خوا ئەم خێرو چاکەیەی بۆ هێناین (کە ئیسلامە)، ئایا دوای ئەم خێرو چاکەیە تووشی شەڕو خراپە دەبین نەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئایا دوای ئەو شەڕو خراپەیە خێرو چاکەی دیکە پەیدا دەبێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام خڵتەو خاڵ (دخن)ی تێدایەو سافو ساغ نیە، گوتم: خڵتەو خاڵەکەی چییە؟ فەرمووی: کە سانێکن کە بە ڕێبازی مندا ناڕۆنو بەشێوەی من ڕەفتارو مامەڵە ناکەن، هەندێك شتیانت پێ چاکەو هەندێك شتیانیشت پێ خراپە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەو خێرو چاکەیە، شەڕو خراپەی دیکە پەیدا دەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، بانگەوازکارانێکن لە سەر دەروازەکانی دۆزەخ هەرکەسێك بەدەمیانەوە بچێ دەیخەنە نێو دۆزەخەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان پێناسە بکە، فەرمووی: لە خۆمانن‌و بە زمانی خۆمان قسە دەکەن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمانمان بە چی پێ دەکەی؟ فەرمووی لە گەڵ کۆمەڵ (جماعة)ی مسوڵمانانو پێشەوا (إمام)ی مسوڵماناندا بە، گوتم: ئەدی ئەگەر ئەو کاتە مسوڵمانان نە

کۆ مەڵیان هەبوو نە پێشەوا، (واتە: نە کۆ مەڵیان هەبوو کە هەموویان یان بەشێکیان کۆبکاتەوە، وە نە پێشەوایەکیان هەبوو کە ببێتە سایەو سێبەریان و قەوارەی سیاسی شیان نەبوو).؟
فەرمووی: واز لەو دەستەو تاقمانە هەموویان بێنە ئەگەر بە ڕەگی درەختێکی شت دانوو سابی. (واتە: تەنیا ڕەگی درەختێت دەستکەوت بیخۆی) تاکو دەمری لەسەر ئەو شێوەیە بمێنەوە.

جا با ئێستا بە هێمنیی و ئارامیی سەرنجێکی وردیی ئەم فەرموودەیە بدەین، کە لەڕاستیدا وتوویژێکی نێوان (حذيفة بن اليمان)و پێغەمبەری خوایە ﷺ: حوزەیفە -خوا لێی ڕازی بێ- لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسێ: ئەو خێرو چاکەیە کە خوا هێناو یەتی کە ئیسلامە لەدوای خراپەو نەفامیی، ئایا هیچ خراپەی دیکەی لەدوا پەیدادەبێ؟ ئەویش دەفەرمووێ: بەڵێ، کە بێگومان وەك لە ڕواڵەتو سیاقی فەرموودەکەوە دەردەکەوێ، مەبەست لەو خراپەیە لادانە لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا حوزەیفە دەپرسێ: ئەدی دوای ئەوە خێرو چاکەی دیکە پەیدا دەبێ؟ ئەویش دەفەرموێ: بەڵێ، بەڵام خەڵتە (دخن)ی تێکەڵەو چاکەو خراپەی تێدایە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بۆی پێناسە دەکات کە چۆنە، دوایی حوزەیفە دەپرسێ: ئەدی دوای ئەو خێرو چاکەیە شەڕو خراپەی دیکە پەیدا دەبێ؟ (واتە: دوای ئەوەی کە لادانو ترازان لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺدا پەیدا دەبێ، بەڵام جارێ پەیکەری ئیسلامو حوکمی ئیسلامیی هەر ماوە، کە بەڕای

زۆر بەی زانا یان مەبە ست پ ێی حوکمڕانیی ڕۆژ گاری بەنی ئومەییەو بەنی عەبباس و عوسمانییەکانە، ئایا دوای ئەوە دیسان شەڕو خرا پە پە یدا دە بێ؟) ئەویش دە فەرموێ: بەڵێ، کە مەبە ست پ ێی بە بۆ چوونی بە ندە ئەو کاتە یە کە خیلا فەتی ئی سلامیی کۆ تایی پێ هاتو خەڵك سایەو سێبەری ئی سلامیان لە سەر نەما، وە چوونە ن ێو پارتو لایە نە عەلمانییەکا نەوە، چونکە دوا یی دە فەرموێ: ((دُ عَاةٌ عَ لَى أ بْوَابِ جَ هَنَّم...)) بانـ گەوازکارانێك لە سەر دەرگا کانی دۆزەخ، هەرکە سێك بەدەمیانەوە بچێ دەیخەنە نێو دۆزەخەوە، وە لەدواییدا حوزەیفە لێی دەپر سێ: ئەی پێغەمـبەری خوا ئا یا ئەوا نە کێن؟ ئەویش دە فەرموێ: لە خۆ مانن و بە ز مانی خۆ مان قـ سە دە کەن، ئن جا لێرەدا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((فاعْتَزِلْ تِلْكَ الفِرَقَ كُلَّهَا)) واز لە هەموو ئەو دە ستەو تاقما نە بێ نە! بەڵێ ل ێرەدا ئەو بەستەزمان و فامکالا نەی گو مان و د لەڕاوکێ دەخە نە د ڵی ئەهلی ئیما نەوە، گوتوویا نە: ئەوە مەبە ست پ ێی تەوژم و لایە نە ئیسلامییەکانە! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە پێنا سەی ئەو جۆرە کە سانەدا بە ڕوون و ڕا شکاویی دە فەرموێ: ((دُ عَاةٌ عَـلَى أ بْوَابِ جَ هَنَّم)) کە ئەو جۆرە کە سانە بانگەواز کەرانێکن لە سەر دەر گاو دەروازە کانی دۆزەخ، جا ئا یا دەرگا کانی دۆزەخ چ ین؟ وە ئا یا خەڵك بە چی و لە کو ێوە دە چێتە ن ێو دۆزە خەوە؟ بێگو مان: بە قەتڵی نا حەق، زو ڵم و

ستەم، زينا، دزيى، سوود خۆريى، حەڕام خۆريى، فێڵ و خيانەت، فەسادو خراپەكاريى، وە پێش هەموو ئەوانە بەهاوبەش بۆ خوادانان (شرك)، بە كوفرو ئيلحادو بە نيفاق‌و دەغەڵيى، بە حوكم نەكردن بە شەريعەتى خوا، كە هەموو ئەوانەى پێش خۆى دەگرێتەوە، دەجا باشە ئايا لايەنە ئيسلامييەكان بانگى خەڵك دەكەن بۆ حوكم نەكردن بە بەرنامەى خواو بۆ قەتڵ‌و زيناو سوود خۆريى‌و ستەم‌و خراپەكاريى‌و گوناح‌و تاوان، تاكو لەسەر دەروازەكانى دۆزەخ وەستابن‌و خەڵك بخەنە نێو دۆزەخ؟! ئايا ئەوە ئيسلامييەكانن، ياخود بە پێچەوانەوە ئيسلامييەكان خەڵك بانگ دەكەن بۆ دەروازەكانى بەهەشت؟! بێگومان ئيسلامييەكان دەڵێن: خەڵكينە وەرن با حوكم بە شەريعەت‌و بەرنامەى خوا بكرێ، خەڵكينە! وەرن نوێژ بكەن، ڕۆژوو بگرن‌و، زەكات بدەن‌و، حەجى ماڵى خوا بكەن، خەڵكينە وەرن بۆ مزگەوت‌و جومعەو جەماعەت‌و يادى خوا بكەن، با پاڕانەوەتان بەس لە خوا بێ، وەرن خوا بەيەكبگرن‌و ئەهلى تەوحيد بن‌و، خۆتان لە شيرك‌و نيفاق‌و ڕياكاريى بە دووربگرن، وەرن لەگەڵ يەك بەڕەحم بن، وەرن با دادگەريى بچەسپێنين، زوڵم‌و خراپە لابەرين‌و، فەرمان بە چاكەو ڕێگريى لە خراپە بكەين...هتد، دياره ئەوانەش هەموو دەروازەكانى بەهەشتن‌و بەهۆى فەرمانبەريى كردن بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ و پابەنديى بە قورئان‌و سوننەت‌و چاكەكاريى‌و دووريى لە تاوان‌و خراپەكاريى

یەوە، خەڵك دەچێتە بەهەشت کەواتە: ئیسلامییەکان خەڵکی بۆ بەهە شت بانگ دە کەنو ئی سلامییەکان (دُ عَـاةٌ عَ لَى أ بْوَابِ الجَنَّة)ن، نەك (دُعَـاةٌ عَلَى أ بْوَابِ جَهَنَّم)! بۆ چی؟ چونکە خەڵك بانگ دەکەن بۆ بەندایەتیی‌و پەرستن‌و فەرمانبەریی بۆ خوا پێغەمبەرەکەی‌و، هەموو ئەو خێرو چاکانەی کە خەڵك بە هۆیانەوە دەچێتە بەهەشت!

ئنجا دەمەوێ لێرەدا قسەی هەندێك لە زانایانی پایە بەرزیش بهێنمەوە، دەر بارەی چۆنیەتی تێگەیشتنی هەرکام لەو دو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ وێنە:

1- (ابن باز) ڕەحمەتی خوای لێبێ کە شەرعزان (فقیه)ێکی زۆر شارەزاو زانا یەکی گەورە بووە، پرسیاری لێ کراوە، گوتوویانە: (إذاً يا شيخنا الكريم الذي يقول بأنّ هذه الجماعات الإسلامية من الفِرَقِ الّتي تدْعو إلى جهنم والتي أمر النبيُّ ﷺ باعتزالها فهمه على كلامكم غير صحيح؟ فقال: الذي يدعو إلى كتاب الله وسنة رسوله ﷺ ليس من الفرق الضالة بل هو من الفرقة الناجية المذكورة في قوله: ((إفترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة...الخ))[1] واتە: ئەی شێخی بەڕێزمان! کەواتە: ئەو کەسەی کە دەڵێ: ئەم

---

1) بڕوانە: (مجموع الفتاوى، مقالات متنوعة) بەرگی هەشتەم لاپەڕە (181-182)

لا یەن و کۆمە ڵە ئی سلامییانە لەو دە ستەو تاق مانەن، کە خەڵك بەرەو دۆزەخ بانگ دە کەن، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە خۆیان لێ دوور بگیرێ، بەپێی قسەی ئێوە ئەو جۆرە لێکدانەوە یە هەڵە یە؟ ئەویش لە وەڵا مدا دە ڵێ: ئەو کەسەی کە خەڵك بانگ دەکات بۆ کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دە ستەو تاق مە گومڕا یەکان نـ یە، بەڵکو لە کۆ مەڵی سەرفرازو دەر باز بوو یە، کە لە فەرمایـ شتەکەی پێغەمبەردا باس کراوە، کە دە فەرمویێ: ((إفترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة...الخ))!

2- ( شيخ نا صرالدّين الألـ باني) ڕە حمەتی خوای لێ بێ کە فەرموودەناس (مُـ حدّث)ی ناوداری ئەم سەردەمەیەو خز مەتێکی زۆر گەورەی لەوبارەوە کردوە، خوا پادا شتی بدا تەوە، لە ژیاننامە کەی خۆ یدا بەو شێوەیە لـ ێی گێڕراوە تەوە: (يـ قال فـ ضيلة الـ شيخ: إن الـ شيخ نا صرالدين الألباني يرفض أن يتعاون مع الجما عات الإ سلامية كـ لها إلاّ إذا انصاعتْ لمعتقداته الكلامية والفقهية؟ فأ جاب: أ بدأ فـأقول: إنّ هذا الكلام زُوْرٌ وبُهتانٌ فقد سبق أن سجلنا ثلا ثـة أ شـرطة في عمان على ثلاثـ ساعات وضّحتُ فيها هذا الأ مر بـ صراحة وكان ممّا قلـته: إنـني أُؤ يّدُ قـ يامَ الجما عات الإ سلامية وأُؤ يّدُ تخصُّصَ كُلِّ جماعة منها بدور اختصاصي سواء كان سيا سياً

أو إقتدِ صادياً أم اجتماعِيّاً)[1]، وا تە: دە گوترێ: کە شێخ ناصرالدینی ئەلبانیی ڕەفزی ئەوە دەکات، کە هاوکاریی بکات لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکاندا، مەگەر کاتێك ملکەچ بکەن بۆ بیرو بۆچوونە ئیعتیقادیی و فیقهییەکانی ئەو؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: لە سەرەتاوە دەڵێم: ئەو قسەیە درۆو هەڵبەستراوە، پێشتریش ئێمە سێ کاسێتمان لە شاری عەممان تۆمار کردوە لە ماوەی سێ سەعاتدا، ئەم مەسەلەیەم بە تەواویی تێدا ڕوون کردۆتەوە، کە گوتوومە: من پشتگیریی هەڵسانودامەزرانی لایەنە ئیسلامییەکان دەکەم، وە پشتگیریی ئەوە دەکەم هەر کامێکیان لە بوارێکدا پسپۆڕیی پەیدا بکات، جا لە بواری سیاسیدا بێ، یان ئابوورییدا، یان لە بواری کۆمەڵایەتیدا!!

3- هەروەها پرسیار کراوە لە: (اللّجنة الدّائمة للبحوث العلمية والإفتاء)، بەرگی دووەم لاپەڕە (239) گوتراوە: (في هذا الزمان عديدٌ من الجماعات والجمعيات وكُلٌّ منها يدعي انْضِواءَهُ تحت الفرقة الناجية، ولا ندري أيُّها على الحقِّ فنتبعها، ونرجو من سيادتكم أن تدلوُنا على أفضل هذه الجماعات وأخْيرِها؟ فأجابت: كُلٌّ من هذه الجماعات تدخل في الفرقة الناجية إلاّ مَن أتى منهم بمكفّرٍ يُخرِجُ عن أصل

---

1) بڕوانە (حياة الألباني وآثاره) بەرگی (1) لاپەڕە (394 ـ 395).

الإيـمان، لكنهم تتفاوت درجاتهم قوةً و ضعفاً بقدر إصابتهم للحق وعملهم به)، واتە: لەم ڕۆژگارەدا لایەن و ڕێکخراوی ئیسلامیی زۆرن و جۆراو جۆرن هەمووشیان دەڵێن: ئێمە لە کۆمەڵی سەرفراز (الفرقة الناجية) ین، داوا لە بەڕێزتان دەکەین پێمان بڵێن کام لەو هەموو لایەنانە لەسەر هەقە تاکو شوێنی بکەوین، باشترو چاکترە؟! لیژنەکەش لە وەڵامدا دەڵێن: هەموو ئەو لایەنە ئیسلامییانە دەچنە نێو کۆمەڵی سەرفراز (الفرقة الناجية)ەوە، مەگەر یەکێکیان شتێکی کردبێ کە پێی کافر بێ و لە ئەسڵی ئیمان بچێتەدەر، بەڵام پلەکانیان بەرزیی و نزمیی تێدایە، بە ئەندازەی ئەوەی کە لە حەق تێگەیشتوون و پێوە پابەند دەبن.

ئەوەش قسەی زانایان کە زۆر ڕوون و ڕاشکاوە لەبارەی نەک هەر ڕەوایی بەڵکە پێویست بوونی هەبوونی لایەنە ئیسلامییەکانەوە، کەواتە: تێگەیشتنی هەڵەو کرچ و کاڵی لەو فەرمایشتانەو کردنیان بە بەڵگەی تۆمەتبارکردنی لایەنە ئیسلامییەکان و بە ناشەرعیی لەقەڵەم دانیان، هیچ بنچینەو بنەمایەکی نیەو بۆچوونێکی قرپۆک و بێخێرە.

- بەڵێ مامۆستاگیان یەکێکی دیکە لەو گومانانەی دروست دەکرێن بەرانبەر کاری ئیسلامیی، ئەو مەسەلەیە کە لەنێو کاری ئیسلامییدا پێی دەگوترێ پەیمان بەستن (البيعة)و دانانی

ئەم یرو برا گەورەو دە لێن: گوا یە ئەم بەیعە تە تایبە تە بە خەلیفەی مسولمانان و ئیمامی ئەعزەم، جا ئایا ئەو مەسەلەی پەیمان و برا گەورەیی یە لە ئیسلامدا چۆنە؟

* مەسەلەی هەبوونی بەیعەت لەنێو کۆ مەڵێك لە مسولماناندا، واتە: ئەوە کە بەڵێن و پەیمانیان پێکەوە هەبێ بۆ کارێکی خێر، شتێکی ئاسایی و شەرعییە وەك تۆزێکی دی ڕوونی دەکەینەوە، چونکە بناغە لە هەڵس وکەوتەکاندا ڕەوایە مەگەر شتێك بە بەڵگەیەکی شەرعیی ڕوون و بێ چەندو چوون قەدەغە کرابێ، وەك بنچینە شەرعییەکە دە ڵێ: (الأصل في المعاملات الإباحة إلأ ما دلّ الشرع على تحريمه)، جا دیارە هەندێك کەس ئەمە ڕەت دەکەنەوەو ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە: ((لا حِلْفَ في الإسلام)) رواهُ البُخاري ومُسلم، واتە، پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە.

بەڵام ئەگەر ئێمە سەرنج لە تێکڕای فەرمایشتەکە بدەین بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ڕستەی: ((لا حِلْفَ في الإسلام)) یانی چی: (..إنّ عاصِمٌ الأحوَل قالَ: قُلْتُ لأنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ أبَلَغَكَ أنَّ النَّبيَّ ﷺ قالَ: ((لاَ حِلْفَ في الإسْلاَمِ))؟ فقَالَ أنسٌ: قَدْ حَالَفَ النَّبيُّ ﷺ بَيْنَ قُرَيشٍ والأنْصَارِ في دارِي) (رواهُ البُخاري برقم: (2294)، ومُسلم برقم: (6410)، وأبوداود برقم: (2926))، واتە: عاصمی ئەحوەل دەڵێ: لە ئەنەسم پرسی - خوا

لـ یێ ڕازی بێ-، ئا یا پ یێت گەیـ شتوە کە پێغەمـ بەر ﷺ فەرموو یەتی: لە ئیـ سلامدا پە یمان بە ستن نـ یە؟ ئەنە سیش گوتی: پێغەمبەر ﷺ لە مالّی مـ نـدا پە یمانی بە ست لە نـێوان قورەیش و ئەنـ صارییەکا ندا، وا تە: ئەوە کە پێغەمـ بەر ﷺ فەرموویەتی: ((لا حِلْفَ في الأسلامِ)) مەبەستی پێ ئەوە نـ یە کە مسولّمانان لەسەر کاری خـێر پە یمان پێکەوە نەبەستـن، بەڵکو مەبەستێکی دیکەی هەیە کە زانایانی ئیسلام ڕوونیان کردۆ تەوە، بەڵام خۆ هەندێك کەس ناگەڕێتەوە بۆ قسەی زانایان، بەڵکو هەر لەخۆڕا مـ لی فەرموودە یەك دە گرێ، بەبێ وردبوو نەوەو لێتـێگەیشتـن!!

(إبن حجر العسقلاني) -ڕەحمەتی خوای لێبێ- دە ڵێ: (وتـضمّن جواب أنـس إنكار صَدْرِ الحديث، لأن فيه نفي الـحِلْف وفيما قاله هو إثبا تـهُ، و يمكن الجَمْعُ بأنّ الـنّفي ما كانوا يعتـبرونه في الجاهلية من نصر الحليف و لو كان ظا لـماً، و من أ خـذ الثـأر من القبيلة بِـسَبَبِ قـتل وا حد منها، و من الـتوارث و نـحو ذ لك) فتح الـباري، بەرگی (10) لا پەڕە (502) (إ بن حـ جر) - زۆر جوان چەمك و وا تای فەرمایـشتەکە لـێك دەدا تەوە - دە ڵێ: وەڵامە کەی ئەنەسی کوڕی مالیك نکوولّیی دەکات لە سـەرەتای فەرمایـشتەکە، چونکە لە فەرموودە کەدا دە فەرموێ: پە یمان بەسـتـن درو ست نـ یە، بەڵام قـسەکەی ئە نەس دە ڵێ: پە یمان بەسـتـن هە یەو لە مالّی مـندا کراوە، جا دەگو نجێ ئاوا کۆبکرێـنەوە: کە پێغەمـبەر

ﷺ دە فەرمویَ: دروست نیە، یانی: پەیمان پێکەوە بەستنێك دروست نیە، کە لە سەردەمیی نەفامییدا بووە، وەك یارمەتیدانی هاوپەیمان هەرچەندە ستەمکاریش بیَ، وە تۆڵە ستاندنەوە لە هۆزێك بەگشتی بەهۆی ئەوەوە کە لەلایەن ئەو هۆزەوە یەکێکی لیَ کوژراوە، وە میرات لە یەکدی گرتن‌و وێنەی ئەوانە.

کەوا تە: بۆ شتی خراپ‌و ستەم، پەیمان بەستن (حلف) دروست نیەو، ئەوەش کە دروستە، پەیمان بەستنە بۆ شتی شەرعیی‌و کاری خێرو چاکە، واتە: ئەگەر کۆمەڵێك لەسەر کاری خێرو چاکە پەیمان ببەستن هیچ تەم‌و مژی لەسەر نیە.

(النووي) یش -ڕەحمەتی خوای لیَ بیَ- لەوبارەوە دەڵیَ: (قال القاضي: قال الطبري: لا يجوز الحلف اليوم فإنّ المذكور في الحديث والموارثة به والمؤاخاة كلّه منسوخ، لقوله تعالى: ...وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ ...﴿٧٥﴾ الأنفال، وأمّا المؤاخاة في الإسلام والمحالفة على طاعة الله والتناصر في الدين والتعاون على البر والتقوى وإقامة الحق، فهذا باق لم ينسخ) (صحيح مسلم بشرح النووي، بەرگی (16) لاپەڕە (81-82))، واتە: (قاضي) گوتوویەتی: (طبري) گوتوویەتی: لەم ڕۆژگارەدا پەیمان بەستن دروست نیە، چونکە ئەوەی لە فەرموودە کەدا باسکراوە، وە میرات پیَ لە یەکدی گرتنی‌و برایەتی پێکردنی، هەمووی نەسخ کراوەتەوە لە بەر

فەرموودەی خوای بەرز: (وە لە کتێبی خوادا خزمان لە خەڵکی دیکە بۆ میراتگران لە یەکدی لە پێشترن..)، بەڵام برایەتیی ئیسلامیی‌و پەیمان پێکەوە بەستن لەسەر فەرمانبەریی کردن بۆ خواو، پشتی یەکدی گرتن بۆ دینداریی‌و هاوکاریی یەکدی کردن لەسەر چاکەکاریی‌و پارێزکاریی‌و چەسپاندنی هەق، ئەوە هەر لەجێی خۆیەتی‌و نەسخ نەکراوەتەوە.

(إبن تیمیە)ش -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- لەوبارەوە نوختە دەخاتە سەر پیت‌و دەڵێ: (و بالجملة فجميع ما يقع بين الناس من الشروط والعقود والمحالفات في الأخوة وغيرها، تُرَدُّ إلى كتاب الله وسنة رسوله ﷺ، فكل شرط يوافق الكتاب والسنة يُوَفّى بهِ ... وإذا وقعت هذه الشروط وفيّ منها بما أمر الله به ورسوله، ولم يُوَفَّ منها بما نهى الله عنه ورسوله، وهذا متفق عليه بين المسلمين) مجموع الفتاوى، بەرگی (35) لاپەڕە (97- 98)، واتە: وە بەگشتی هەموو ئەو شتانەی لەنێو خەڵکدا نە، وەك: مەرج پێکەوە دانان‌و پەیمان پێکەوە بەستن‌و بەڵێن پێکەوە دانان لەسەر برایەتی‌و غەیری برایەتی، هەمووی دەگێڕدرێتەوە بۆ قوڕئان‌و سوننەت، جا ئەوەی بەپێی قوڕئان‌و سوننەت بێ جێبەجێ دەکرێ‌و، ئەوەی پێچەوانەشیان بێ جێبەجێ ناکرێ، ئنجا دەڵێ: هەرچی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان پێ کردبێ، ئەوە ئەو پەیمانە دەبرێتە سەر، بەڵام ئەوەی خوا پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردبێ، ئەوە نابێ جێبەجێ بکرێ،

وە ئەمە لەنێوان مسوڵمانانداڕێککەوتن و یەکدەنگیی لە سەرە. ئەوە سەبارەت بە پەیمان بەستن.

دەر بارەی دانانی بەرپرس و برا گەورەش، بەکورتی دەڵێم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((إذا خرج ثلاثة في سفرٍ فليؤمّروا أحدهم)) (رواه أبوداود برقم: (2608)، وغيره و قال الألباني حديثٌ حسنٌ صحيحٌ)، واتە: ئەگەر سێ کەس بە سەفەر چوون با یەکێکیان بکەنە فەرماندەو بەرپرس.

جا ئەگەر بۆ کۆمەڵێکی کەمی سێ نەفەریی و بۆ بەسەفەرچوونێکی کەم و کاتیی، پێویست بکا ئەمیرو بەرپرس هەبێ، چۆن نابێ بۆ کاروباری دیکەی گەورەو گرنگ برا گەورەو فەرماندە هەبێ؟!

پاشان لەوبارەوە پرسیار لە (إبن تيمية) کراوە: (سُئِل شيخ الإسلام عن جماعة يتخذون لهم رأساً ويسمون حزباً ويدعون الى بعض الأشياء؟! فقال: الأحزاب الّتي أهلها مجمعون على ما أمر الله به ورسوله من غير زيادة ولا نقصان، فهم مؤمنون، لهم ما لهم وعليهم ما عليهم، وإن كانوا زادوا في ذلك ونقصوا مثل التّعصُّب لمن دخل في حزبهم بالحقّ و بالباطل، والإعراض عمن لم يدخل في حزبهم، سواء كان على الحقّ أو الباطل، فهذا من التفرُّق الذي ذمّهُ الله تعالى ورسولهُ)، جامع الرسائل والمسائل، بەرگی (1) لاپەڕە (152-153)، واتە: پرسیار لە شێخی ئیسلام کراوە دەربارەی کۆمەڵێك کە لەنێوان خۆیاندا یەکێك دەکەنە سەرۆك

ناو لە خۆیان دەنێن حیزب، وە خەڵك بۆ هەندێك شت بانگ دەکەن، ئا یا حوکم یان چییە؟! دەڵێ: ئەوحیزبا نەی کە خەڵکەکەیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیان پێکردوە، بەبێ لێکەمکردن و لێ زیادکردن، ئەوە ئەوانە بڕوادارن و هەمان ماف و ئەرکەکانی ئەوانیان هەیە، (واتە: لە هەموو ڕوویێکەوە حەق و حیسابیان وەك مسوڵمانانە)، بەڵام ئەگەر لێیان کەم و زیاد کرد، وەك دەمارگیریی بۆ هەرکەسێك کە بچێتە حیزبەکەیانەوە بە هەق و بە ناهەق، وە پشتگوێ خستنی هەرکەسێك کە نەچێتە نێو حیزبەکەیانەوە، جا چ لەسەر هەق بێ چ لە سەر نا هەق، ئا ئەو ڕەفتارو هەڵوێستە لەو پەرتەوازەییەیە کە خوای بەرزو پێغەمبەرەکەی ﷺ بە خراپیان داناوە.

کەواتە: ئەسڵ ئەوەیە مسوڵمانان پێکەوە تەباو کۆك بن و، ئەوەش کە ئەمیرو سەرۆك و برا گەورەیەکیان هەبێ، مادام بۆ ئەنجامدانی کارێکی خێرو پەسند بێ، وەك زانایانی ئیسلام دەڵێن، هیچ گرفت و غوبارێکی لەسەر نییە، بگرە جاری واهەیە فەرزیش دەبێ، مادام ئەو کارەی پەکی لەسەری کەوتوە، فەرزبێ، بەپێی بنچینەی: (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب) هەر شتێك فەرزێك پەکی لە سەری بکەوێ ئەویش فەرزە، وە بەپێی بنچینەی: (للوسائل حكم المقاصد) هۆکارەکان هەمان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم هەروا بە کورتیو پوختی پێناسەیەکی سەلەفییەت (السلفية) بکەم، چونکە بەڕاستیی لەم ڕۆژگارەدا هەندێك کەس ناوی سەلەفیی هەر بەخۆیان ڕەوا دەبینن، دیارە وەك پێشتر باسم کرد سەلەفیی بوون ئەوەیە کە تۆ لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەڕێزیو پێشینەی چاك (السلف الصالح) بی، ئەگەر ئەو ناوەش هەڵنەگری، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەو ڕێبازە نەڕۆیو خەسڵەتەکانی ئەوانت تێدا نەبێ، هەر چەندە ئەو ناوەش لە خۆت بنێی بێگومان هیچ سوودی نیە!

لەوبارەوە چەند دێڕێکی زانای پایەبەرز (إبن عثيمين) ئاماژە پێدەکەم، ڕەحمەتی خوای لێبێ، کە پرسیاریان لێکردوە سەلەفییەت چییە؟ (ما هي السلفية؟) ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: (السلفية هي اتّباع منهج النّبيّ ﷺ وأصحابه، لأنهم سلفنا تقدّموا علينا فاتّباعهم هو السلفية، وأما اتخاذ السلفية كمنهج خاص ينفرد به الإنسان ويضلّلُ من خالفهم من المسلمين ولو كانوا على حقّ، فلا شكّ أنّ هذا خلاف السلفية ... فالسلفية بمعنى أن تكون حزباً خاصاً له مميزاته ويُضَلّلُ أفرادُهُ مَنْ سواهم، فهؤلاء ليسوا من السلفية في شيءٍ) (منهج الأئمة في التعامل مع المُخالِف، لسراج الدين اليماني)، ص(265-266)، واتە: سەلەفییەت بریتییە لە شوێنکەوتنی بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەڕێزی، چونکە ئەوان لەپێش ئێمەوە

بوون - چونکە سەلەف، واتە: ئەوەی لەپێش تۆیە-، بەڵام کە سەلەفییەت بکرێتە بەرنامەو پەیڕەوێك ئینسان لە سەر خۆی فۆرخی بکاتو غەیری خۆی کە ئەو ناوەی لەخۆی نەناوە، بەگومڕای دابنێ هەر چەند لە سەر حەقیش بێ، ئەوە هیچ پەیوەندی بە سەلەفییەتەوە نیە، دوایی دەڵێ: سەلەفییەت بەو واتا یەی کە دەکرێ بە حیزبێکی تایبەتو چەند تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، وە تاکەکانی ئەو کۆمەڵو حیزبە خەڵکی دیکە بە گومڕا دابنێن، ئەوانە هیچ پەیوەندییەکیان بە سەلەفییەتەوە نیە!! ئاشکراشە بە پێی ئەم پێناسەیەی (إبن عثیمین) گەلێك (سەلەفیی ناو)ی ئەم ڕۆژگارە وەك گەڵای درەختی پایز هەڵدەوەرنو، زۆر خەڵکی دیکەش کە ئەو ناوەی هەڵنەگرتووەو نێومڕۆکەکەیان پێیە بە سەلەفیی ڕاستەقینە دەژمێرریێن! خوا بە لوطفو کەرەمی خۆی هەمووومان وا لێبکات بە کردەوە لە سەر ڕێبازو بەرنامەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بەرێزیو پێشینەی چاکمان بڕۆین، وە خۆمان بە سیفەتە بەرزەکانی ئەوان برازێنینەوەو، خۆمان لەو سیفەتانە بەدوور بگرین کە ئەوان خۆیان لێ دوور گرتوون، تاکو بە کردەوە لە سەر ڕێبازی سەلەفیی صالح بین، نەك تەنیا بە قسەو بانگەشە، وە خوای پەروەردگار بە لوطفو کەرەمی خۆی دڵی هەموو لایەکمان زیاتر بەیەکەوە گرێ بدات، لە سەر بناغەی خۆشەویستی خۆیو پێغەمبەر ﷺو پابەندیی بە قورئانو

## بەرهەمەکانی دانەر

1- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی 2/ 2006.

2- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان. چاپی 3/ 2006

3- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا. چاپی 1 /1987

4- کۆمەڵی خوا. چاپی 1 / 1988

5- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسولمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ چاپی3 /2001

6- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامی. چاپی 1 /1989

7- ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کامەیە؟! چاپی 1/ 1989

تێبینی: دواتر خرایە نێو کتێبی (مسولمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسولمان) وە دواتر ئەمیش خرایە نێو کتێبی (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە .

8- ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون. چاپی 3 /2005

9- کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! چاپی 1 / 1989

10- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت. چاپی 2 /2005

11- سۆزی نەتەوایەتی‌و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی3 /2005

12- مسولمانی کامڵ/ بەشی یەکەم: بیروبڕوای مسولمان. چاپی1

1997/

تێبینی: ((دوا تر خرا یە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە)).

13- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەمان دا. چاپی 1 /1992

14- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەمان دا. چاپی 1 /1993

15- بزووتنەوەی ئیسلامییو ئایندەیەکی گەشو ڕوون. چاپی 1 / 1995

16- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی 1 / 1996

17- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی 1 /1996

18- ئیسلامو کێشە هەنووکەییەکان. چاپی 1 /1995

19- باور یا بڕین! داڕووخانی ڕەوشتی کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی 2 /2006.

20- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی یەکەم/ خواپەرستی بەگشتی، پاكوخاوێنی .

21- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی دووەم/ نوێژ بەرپاکردن .

22- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی سێیەم/ ماڵ بەخشینو زەکات.

23- خواپەرستی ئیسلامیی: بەشی چوارەم/ ڕۆژوو گرتن، حەجو عومرە، زیکری خوا.

24- گەڕانەوە بۆ لای خـوا (عزّ وجلّ) . چاپی 5 / 2010

25- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! چاپی 2 / 2002

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

26- بنچینە گرنگەکانی هەڵس و کەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییـەکاندا، چاپی 1 / 1999 .

تێبینی: ئەم نامیلکەیە باسێکی بەرگی یەکەمی کتێبی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یە، وە بۆ زمانی عەرەبیـش وەرگێـڕراوەو ئێستا لەژێر چاپە.

27- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی 1 / 2000

28- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی 1 / 2000

29- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتیەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن .

تێبینی: (ئەم نامیلکەیە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی).

30- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی. چاپی 1 / 2001

31- پاساو و بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵیی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: 1و 2 و 3 و 4 . چاپی 1 / 2001

32- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی 1 / 2000.

33- ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا . چاپی 2 / 2005

34- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم . چاپی 5 / 2005

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

35- چەند ڕێڕوونی یەك بۆ خو شك و برایا نمان لە هە ندەران. چاپی 1 / 2002

36- سنوورە قەدە غەکان مە شکێنن! ( چاوپێکەوتنی دکتۆر حسین محمد عزیز). چاپی 2 / 2003

37- چۆن هەڵس و کەوت لە گەڵ خەڵکی دا بکەین؟! چاپی 1 / 2002

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

38- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە؟! چاپی 1 / 2002

39- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگاداری یەك. چاپی 1/ 2002

40- بۆ ئەوەی لە سەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی 1 / 2002

41- جیهاد لەڕێی خوادا چی یەو بۆ چی دە کرێ و چۆن دە کرێ؟ چاپی 1/ 2002.

42- ئەشکەنجەو زیندان ( چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر) چاپی 2/ 2006 .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی

فارسیشی کراوەو چاپ‌و بلاوکراوەتەوە.

43- کارو پرۆژەی ئیسلامیمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی 2 / 2006 .

44- ئیسلام‌و مسوڵمانەتی‌وکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەتدا. چاپی 1 / 2006 .

45- ئیمان‌وعەقیدەی‌ئیسلامیی. بەرگی/1، ئیمان‌وعەقیدەی ئیسلامی چی‌یەو چۆنە؟! 1 تا 12 . چاپی 1 / 2006

46- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ 2، خوا بە یەکگرتن (التوحید) لە بەدیهێنەرا یەتیی‌و پەروەردگاریێتی دا. 13 تا 26 . چاپی 1 / 2006

47- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ 3، خوا بە یەکگرتن لە ناوو سیفەت‌و لە پەرستراویێتی دا، 27 تا 36 . چاپی 1 / 2007

48- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ 4، ئیمان بە فریشتەکانی خوا (عزّوجل)، کتێبەکانی خوا (عزّوجل)، پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام). 37 تا 40 . چاپی 1 / 2007

49- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/ 5، ئیمان بە ڕۆژی دوایی قەزاو قەدەر 41 تا 45 . چاپی 1 / 2008

50- ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی. بەرگی/6، تایبەتمەندیی‌و دیدو بۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست. 46 تا 50 . چاپی 1 / 2008

51- تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان.

چاپی 1/ 2007

تێبینی: زۆربەی بە (24) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)و ئەوەی دیکەش بە (9) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

52- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی کردنەوەدا.

53- بە دوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟

54- سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك.

55- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ‌و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی.

56- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی.

57- قوتابیانی زانیاری شەرعیی چەند سەرنج‌و ڕێنمایی یەك.

58- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە.

59- بانگەواز بۆ لای خوا .

60- قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن؟!

61- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

62- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم). کە دوایی لە شێوەی نامیلکەدا چاپ کراوە.

63- خواناسیی، ئایین ، ئیمان. چاپی 2 / 2009 .

64- واقیعی هەرێمی کوردستان ...دیدێکی ئیسلامییانە. چاپی1/ 2008.

65- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەت دا.

چاپی 1 / 2008

66- چۆن باشتر لە کتێبی بەڕێزی خوا بەهرەمەند دەبین؟!
چاپی 1/ 2008 .

67- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا

تێبینی: ئەم نامیلکەیە بە (14) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە.

68- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ. چاپی 2010/1 .

69- چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحی دا

## ئەو بەرهەمانەی لەژێر چاپن

1- الإسلام كما يتجلى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد الأول.
2- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان .
3- خاتوو عائیشە دایکی بڕواداران.
4- مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك.

# ئەو بەرهەمانەی چاوەڕێی چاپن.

1- الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تبارك وتعالى، المجلد 2- 7 .
2- خووو ڕەوشتی ئیسلامیی.
3- ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا. بەرگی دووەم.
4- گرنگیو پێویستی پابەندیی بە قورئانو سوننەتەوە.
5- چەند دەرسێك لە: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، کە ئەگەر خوا تەمەن بدات هەموو قورئان تەواو دەکەین.

جم‌وجۆڵ‌و كاری ئیسلامیی لەم ڕۆژگارەماندا لەگەڵ تۆمەت‌و گومانی زۆرو جۆراوجۆردا ڕووبەڕوو بۆتەوە، چ لەلایەن كەسانێكی عەلمانیی‌و ناحەزی پڕۆژەی ئیسلامییەوە، كە نەك هەر بڕوایان بەكارو چالاكیی ئیسلامیی نیە، بەڵكو هەر لە بنەڕەتەوە -ئەگەر بوێرن بیڵێن- بڕوایان بە ئیسلام نیە، كە وەك خوا فەرمانی كردوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان‌و گوزەرانی تاك‌و كۆمەڵ بێ! وە چ لەلایەن خەڵكێكی مسوڵمان‌و ئیسلامییشەوە، كە بە پاڵنەری جۆراو جۆرەوە لەو كاروچالاكیی ئیسلامییەكە لەلایەن حیزب‌و ڕێكخراوە ئیسلامییەكانەوە ئەنجام دەدرێ، كەوتوونە تەقەو هەندێكیان هەموو ئامانج‌و مەبەست‌و ئەوپەڕی گرنگیی پێدانی خۆیان لەوەدا چڕكردۆتەوە، كە قوتابی‌و شوێنكەوتووەكانیان بەوە ئیقناع بكەن، كە حیزب‌و ڕێكخراوە ئیسلامییەكان، بوونیان شتێكی ناڕەوایەو لادانە لە جادەی شەریعەت! هەروەها كات‌و توانایەكی زۆر لەپێناوی ئەوەدا خەرج دەكەن كە كەسانێكی متمانە پێكراوو بەتوانای نێو كارو پڕۆژەی ئیسلامیی، كە دەزانن زیاتر قسەیان لێ وەردەگیرێ‌و گوێیان بۆ دەگیرێ، لەپێشچاوی قوتابی‌و شوێنكەوتوانیان ببێزرێنن‌و بشێوێنن، وەك ئیسلام‌و مسوڵمانان هیچ گرفت‌و كێشەیەكیان نەمابێ، ناشیرین [illegible] لەكەدار [illegible] نەبێ!

ئنجا لەم نامیلكەیەدا تەم‌و مژی سەرجەم ئەو تۆمەت‌و گومانانە بەبەڵگەی عەقڵ‌و نەقڵ ڕەوێنراونەوە.

نوسینگەی تەفسیر